# گوڵبژێرێك

## له فه‌تواكانی زانای پایه‌به‌رز

## الشيخ محمد بن صالح العثيمين

( رحمه الله)

**كۆكردنه‌وه‌و وه‌رگێڕانی**

**مامۆستا  صلاح الدين عبدالكريم**

==========================================================

**له‌بڵاوكراوه‌كانی**

**ماڵپه‌ڕی به‌هه‌شت و وه‌ڵامه‌كان**

**ba8.org**

**walamakan.com**

هه‌میشه له‌گه‌ڵمان بن بۆ به‌رهه‌می نوێ

# ناوەڕۆكی ئەم كتێبەیە بریتی یە لە :

حوكمی خۆ ته‌قاندنه‌وه له‌ناو كافراندا :

حوكمی سه‌لام كردن له بیدعه‌چی :

حوكمی سه‌لام كردن له كافر :

ده‌ست پێكردنی ته‌وقه كردن :

هێشتنه‌وه‌ی وێنه له ماڵه‌وه :

گێڕانه‌وه‌ی نوكته‌و قسه‌ی هه‌ڵبه‌ستراو :

ده‌ركردنی غوسل به بێ ده‌ست نوێژ هه‌ڵگرتن :

سه‌ره‌نجامی ئافره‌تی باوه‌ڕدار له‌به‌هه‌شتدا

ئه‌گه‌ر پێش شوكردنی بمرێت :

شیردانی ئافره‌ت به منداڵی جگه له خۆی به پیاڵه :

ئامۆژگاری كردنی خه‌ڵكی به‌شێوازێكی به‌رده‌وام له‌سه‌ر گۆڕ:

سڕینه‌وه‌ی چاكه‌كان :

حه‌ج كردنی ئافره‌ت به بێ مه‌حره‌م :

حه‌ج كردن له جیاتی نه‌خۆش :

سیواك كردن له‌كاتی به‌ڕۆژوو بووندا :

كردنی هه‌ندێك له ڕۆژو به‌تاڵ كه‌ره‌وه‌كان به نه‌زانی :

قه‌زا نه‌كردنه‌وه‌ی ڕۆژوو بۆ ماوه‌ی سی ساڵ :

به ڕۆژوو نه‌بوون به هۆی سه‌فه‌ر كردن به فرۆكه :

ماوه‌ی خه‌تم كردنی قورئان :

ئاشكرا كردنی به‌ڕۆژوو نه‌بوون له‌سه‌فه‌ردا :

بەكارهێنانی حەبی ڕاگرتنی خوێنی

بێ نوێژی ( حەیز ) بۆ پێویستی :

ڕۆژوو شكاندنی ڕێبوار لەسەفەردا :

لەبەر كردنی جل وبەرگێك كه وێنەی تێدا بێت :

فیكه لێدان وچه پڵه لێدان :

له پێ كردنی پانتۆڵ بۆ ئافرەتان :

بڕینی قژی ئافرەت تا ناو شانی بۆجوانی،

وبەكارهێنانی ئامێرەكانی جوانكاری بۆ مێرد :

پاك بوونەوەی ئافرەت لەبێ نوێژی( الحيض ) وبەرۆژووبوونی :

پاك بونەوەی ئافرەتی زەیستان ( النفساء ) پێش چلەی :

بینینی خوێنی بێنوێژی ڕۆژێك ونەمانی بۆ رۆژی داهاتوو :

حوكمی فرۆشتنی ئەڵقەی ئاڵتون بۆ پیاوان :

فرۆشتنی ئاڵتون به پاره نابێت تا هەموو پارەكە وەرنەگرێت :

حوكمی فرۆشتنی ئەو ئاڵتونەی كه رەسم و وێنەی تێدایه :

دەرچونی ئافرەت بۆ بازاڕ بەبێ مەحرەم :

## پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحمدَ للهِ، نحمده، ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله مِن شرور أنفسنا، ومِن سيئات أعمالنا، مَن يهده الله فلا مضل له، ومَن يضلل فلا هادي له، وأشهد أنْ لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾.

(آل عمران:١٠٢)

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ (النساء: ١) .

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً.. يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ (الأحزاب:٧٠-٧١)

أما بعد : فإن خير الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار .

لەپاشاندا: یەکێك لە تایبەتمەندێتییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەیە کە هەموو شتێك موسڵمانان پێویستیان بێت لە ژیانی دین و دونیایاندا بۆیان روون کراوەتەوە تێیدا، وە خوای گەورە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) نەبردەوە بۆ لای خۆی تا هەموو دینەکەی پێ تەواو کرد: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ [المائدة: ٣].

واتە: ئەمڕۆ من دینەکەم بۆ تەواو کردن، وەبەخششی خۆم تەواو رژاند بەسەرتاندا، ورازی بووم کە ئیسلام ئاینی ئێوە بێت.

وه پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: (تركتُكُمْ على مثل البيضاءِ ليلُها كنَهارِهَا لايَزِيغُ عنها بعدي إلا هالِكٌ)[1].

واته: بەجێتانم هێشتووه لەسەر دین ورێگایەکی سپی، که شەوی وەکو رۆژی روناکه، بۆیه هیچ کەسێك لێی لانادات وگومڕا نابێت مەگەر کەسێکی به هیلاك چوو.

وه دەفەرمێت: (ما بَقِيَ مِنْ شَيءٍ يُقَرِّبُ مِنَ الجَنَّةِ ويُباعِدُ مِنَ النَّارِ إلّا بُيِّنَ لَكُم)[2].

واته: هیچ شتێك نەماوه که له بەهەشت نزیکتان بکاتەوه وله ئاگری دۆزەخ دورتان بکاتەوه ئیللا پێتان وتراوەو بۆتان روون کراوەتەوه.

وەأبوذر (خوای لێ رازی بێت ) دەفەرمێت: (وما طائِرٌ يُقَلِّبُ جَناحَيهِ فِي الهَوَاءِ إلا وَهُوَ يَذْكُرُ لَنَا مِنْهُ عِلْمَاً)[3]. واته: هیچ باڵندەیەك له ئاسماندا باڵەکانی ئەم دیوو ئەو دیو نەکردووه ئیللا پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) زانیارییەکی تێدا بۆمان باس کردووه.

وه سەلمانی فارسی(خوای لێ رازی بێت ) کاتێك که جولەکەیەك پرسیاری لێ دەکات و دەڵێت: ئێوه دەڵێن پێغەمبەرەکەمان(صلى الله عليه وسلم) هەموو شتێکی فێر کردووین تەنانەت شێوازی چوونه سەر ئاویش؟ ئەویش لەوەڵامدا دەفەرمێت:

(أجَلْ لَقَدْ نَهَانَا أنْ نَسْتَقْبِلَ القِبْلَةَ لِغَائِطٍ أو بَوْلٍ، أو أنْ نَسْتَنْجِيَ بِاليَمِينِ، أو أنْ نَسْتَنْجِيَ بِأقَل مِنْ ثَلاثَةِ أحْجَار، أو أنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أو بِعَظْمٍ)[4].

---

١- ( رواه إبن ماجة، وصححه الشيخ الألباني في: ظلال الجنة، رقم:٤٩).

٢- (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٤/ ٤١٦).

٣- نفس المصدر.

٤- ( مسلم: ١/ ٢٢٣، رقم: ٥٧/ ٢٦٢).

واته: به‌ڵێ، قه‌ده‌غه‌ی ئه‌وه‌ی لێ كردوین كه‌ روو له‌ قیبله‌ بكه‌ین له‌كاتی سه‌رئاودا، یاخود به‌ده‌ستی راست خۆمان پاك بكه‌ینه‌وه‌، یاخود به‌ كه‌متر له‌سێ به‌رد خۆمان پاك بكه‌ینه‌وه‌، یاخود به‌ پاشه‌ڕۆی ئاژه‌ڵ وئێسقان خۆمان پاك بكه‌ینه‌وه‌.

كه‌واته‌: له‌م ئایه‌ت و فه‌رموودانه‌وه‌ بۆمان ده‌ركه‌وت كه‌ هه‌موو شتێك له‌ ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا به‌ جوانی روون كراوه‌ته‌وه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر هه‌ركه‌سێك له‌هه‌ر شتێكی دینه‌كه‌یدا ئاڵۆزی ونادیاری‌یه‌كی هه‌بوو، یاخود گرفت وكێشه‌یه‌كی هه‌بوو، یاخود توشی گومان و دوودڵی‌یه‌ك بوو ئه‌وا خوای گه‌وره‌ رێنمونی كردوین كه‌ بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆلای زانایان، چونكه‌ ئه‌وان میراتگری پێغه‌مبه‌رانن، وه‌ پێغه‌مبه‌رانیش دینارو درهه‌میان به‌جێ نه‌هێشتووه‌، به‌ڵكو زانست وزانیاری‌یان به‌جێ هێشتووه‌.

وه‌تاكو زانایان له‌ناو خه‌ڵكیدا بمێنن ئه‌وا خه‌ڵكی هیچ كێشه‌و گرفتێكیان نابێت له‌ دینه‌كه‌یاندا ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆلای زانایان، به‌ڵام گرفت و كێشه‌ ئه‌و كاته‌ ده‌ست پێ ده‌كات وسه‌ر هه‌ڵ ده‌دات كه‌ زانایان له‌ناو خه‌ڵكیدا نه‌مێنن وكۆچی دوایی بكه‌ن، یاخود خه‌ڵكی نه‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆلایان له‌ كێشه‌و گومان وپرسیاره‌كانیاندا، به‌ڵكو بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆلای كه‌سانێكی نه‌زانی خۆبه‌زانا كه‌ فه‌توا بۆ خه‌ڵكی بده‌ن وخۆیان وخه‌ڵكیش گومڕا بكه‌ن و له‌رێگای راستیان ده‌ربكه‌ن، وله‌بابه‌تی گه‌وره‌ی وا فه‌توا ده‌ده‌ن كه‌ سه‌ره‌نجامی ئوممه‌تی ئیسلامی پێوه‌ په‌یوه‌سته‌، وه‌به‌هۆی فه‌تواكانیانه‌وه‌ موسڵمانان توشی گێژاوو كاره‌ساتی وا ده‌كه‌ن كه‌ ئه‌نجامه‌كه‌ی سوپاس كراو نابێت، پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) ده‌فه‌رمێت:

(إنَّ اللهَ لا يَقْبِضُ العِلْمَ إنْتِزَاعاً يَنْتَزِعُهُ مِنَ العِبادِ، ولكِنْ يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَمَاءِ، حَتى إذا لَمْ يَبْقَ عالِمٌ إتَّخَذَ النَّاسُ رؤوساً جُهَّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوا بِغَيرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا)[٥].

٥- ( صحيح الجامع الصغير، رقم: ١٨٥٤).

واته‌: خوای گه‌وره‌ زانست هه‌ڵناگرێت وناهێڵێت به‌وه‌ی كه‌ له‌ سینگی خه‌ڵكیدا ده‌ری بكات، به‌ڵكو زانست هه‌ڵده‌گرێت ونایهێڵێت به‌ نه‌هێشتن وبردنه‌وه‌ی زانایان، هه‌تا وای لێ دێت زانا نامێنێت، ئه‌وكاته‌ خه‌ڵكی سه‌رانێكی نه‌زان ونه‌فام بۆ خۆیان داده‌نێن و پرسیاریان لێ ده‌كه‌ن ئه‌وانیش به‌بێ زانیاری وه‌ڵامی خه‌ڵكی ده‌ده‌نه‌وه‌ وفه‌توایان بۆ ده‌ده‌ن وخۆیشیان وخه‌ڵكیش گومڕا ده‌كه‌ن.

له‌كاتێكدا كه‌ زانایانی پێشینه‌ چاكه‌كانی ئه‌م ئوممه‌ته‌ زۆر خۆیان ده‌پاراست وخۆیان دوور ده‌گرت له‌ فه‌توا دان، تا ئه‌گه‌ر له‌ناو كۆمه‌ڵێكیاندا پرسیار له‌ یه‌كێكیان بكرایا وه‌ڵامی نادایه‌وه‌و ئاراسته‌ی ئه‌وه‌ی ته‌نیشتی ده‌كرد، ئه‌ویش به‌هه‌مان شێوه‌ تا پرسیاره‌كه‌ ده‌گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ یه‌كه‌م كه‌س.

وه‌ كاتێك خه‌ڵكی شام چل پرسیاریان لێ گیر ده‌بێت و وه‌ڵامی نازانن به‌یه‌كێكدا ده‌ینێرن بۆ مه‌دینه‌ بۆ لای ئیمامی مالیك، ئه‌ویش له‌ چل پرسیاره‌كه‌ ته‌نها وه‌ڵامی چواری ده‌داته‌وه‌ وبۆ سی وشه‌شه‌كه‌ی تری ده‌ڵێت نازانم، كابرایش كه‌ له‌ شامه‌وه‌ هاتووه‌ ده‌ڵێت: ئێستا كه‌ من چوومه‌وه‌ چی به‌ خه‌ڵكی شام بڵێم ئه‌وان چاوه‌ڕوانی وه‌ڵامن؟! ئیمامی مالیكیش زۆر به‌ خۆ به‌كه‌م زانینه‌وه‌ ده‌فه‌رمێت: پێیان بڵێ ووتی: نازانم .

چونكه‌ ئیمامی مالیك ده‌یزانی كه‌ (مِنَ العِلْمِ أنْ يَقولَ لِمَا لا يَعْلَمُ اللهُ أعْلَمُ)[٦]. واته‌: ئه‌ویش هه‌ر له‌زانیاری‌یه‌ كه‌ مرۆڤـ شتێكی نه‌زانی وه‌ڵام نه‌داته‌وه‌و بڵێت: خوای گه‌وره‌ باشتر ده‌زانێت.

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه‌ ئیمامی مالیك وپێشه‌وایانی تری پێشینه‌ چاكه‌كان زانا بوونه‌ و كۆشش كه‌ر بوونه‌ ئه‌گه‌ر فه‌توایان بدایاو هه‌ڵه‌یشیان بكردایه‌ تاوانبار نابوون وئه‌جر پاداشتێكیان هه‌بووه‌ له‌سه‌ر كۆشش كردنه‌كه‌یان، به‌ڵام به‌هۆی له‌ خواترسان وخۆپارێزی‌یانه‌وه‌، خۆیان گرتۆته‌وه‌ له‌و شتانه‌ی كه‌نه‌یان زانیووه‌، به‌ڵام له‌ناو خه‌ڵكانی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ هه‌یه‌ هیچ زانستێكی شه‌رعی وای نه‌خوێندووه‌ كه‌به‌هۆیه‌وه‌ شاره‌زایی‌یه‌كی باش په‌یدا بكات له‌ دین تا بتوانێت فه‌توا بدات به‌ڵام جۆره‌ها فه‌توا

---

٦- (متفق عليه عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه)، وانظر: مشكاة المصابيح رقم:٢٧٢).

دەدات وسنوری خوای گەورە دەبەزێنێت وهیچ كات لێ‌ی نابیستیت بۆ تەنها جارێكیش بێت كە پرسیارێكی ئاراستە كرا بلێت نازانم، بەڵكو تۆ چ جۆرە پرسیارێك دەكەیت ئەو وەڵام دەداتەوە، وە جۆرەها شتیان حەڵاڵ كردووە بەهۆی نەزانی وهەواو ئارەزووەكانی خۆیان وخەڵكی، تا خەڵكی پێیان نەڵێت توندو تیژ ولێیان رازی بن، بەڵام لە بیریان كردووە یاخود لە بیری خۆیان بردۆتەوە كە: (مَنِ التَمَسَ رِضَا اللهِ بِسَخَطِ النَّاسِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَأَرْضَى عَنْهُ النَّاس، وَمَنِ التَمَسَ رِضَا النَّاسِ بِسَخَطِ اللهِ سَخِطَ اللهُ عَلَيهِ وَأَسْخَطَ عَلَيهِ النَّاس)[٧].

واتە: هەركەسێك خوای گەورە لە خۆی رازی بكات بە تورە بوونی خەڵكی ئەوا خوای گەورەیش لێ‌ی رازی دەبێت وخەڵكیشی لێ رازی دەكات، وە هەركەسێك خەڵكی رازی بكات بە تورە بوونی خوای گەورە ئەوا خوای گەورەیشی لێ تورە دەبێت وخەڵكیشی لێ تورە دەكات.

هەروەها رەزامەندی خەڵكی مەبەستێكە هەرگیز بەدەست نایات، چونكە تا كۆمەڵێك لە خۆت رازی دەكەیت كۆمەڵێكی ترت لێ دەرەنجێت، وەكو ئیمامی شافیعی(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمێت: (رِضَى النَّاسِ غَايَةٌ لا تُدْرَكُ)، بەڵام رازی كردنی خوای گەورە ئاسانە ومرۆڤـ دەتوانێت ئەو رێگایانە بگرێتە بەر كە بە هۆیەوە رەزامەندی خوای گەورە بەدەست دێت، هەرچەندە ئەگەر كەسێك ئەو رێگایانە بگرێتە بەر وبەجوانی دەست بگرێت بە دینەكەیەوە وپەیوەست بێت بە قورئان وسوننەتەوە بە تێگەیشتنی پێشینە چاكەكان ئەوا تۆمەت بار دەكرێت بەوەی كەتوند وتیژە ودین ئاسانەو پێویست بە توندو تیژی ناكات!! ئەمە ووشەیەكی حەقە بەڵام مەبەست پێ‌ی بەتاڵە، مەبەست پێ‌ی ئەوەیە كە خەڵكی حەزیان لەچی بوو وە چی مۆدێل وداب ونەریتێكی رۆژهەڵاتی ورۆژئاوایی هاتە ناو موسڵمانانەوە حەڵاڵ بكرێت بەناوی دین ئاسانیەوە، ئەوەتا جۆرەها شت حەڵاڵ كراوە لەبەر رەزامەندی خەڵكی تا كار گەیشتۆتە ئەوەی كە تەوقە كردنی ژن وپیاوی بێگانە پێكەوە، وشوكردنی

---

٧- (صحیح الترغیب والترهیب، رقم: ٢٢٥٠).

ئافره‌تی موسڵمان به‌ گاورو جوله‌كه‌، وده‌رخستنی سه‌ر وقژ وملی ئافره‌تان بۆ پیاوی بێگانه‌، وپێش نوێژی كردن ووتار خوێندنی هه‌ینی له‌لایه‌ن ئافره‌تانه‌وه‌ بۆ پیاوان، و.......... فه‌توای حه‌ڵاڵ بوونیان بۆ دراوه‌ وخه‌ڵكانێكیش هه‌ن كه‌ جێبه‌جێیان ده‌كه‌ن. وه‌ بۆ دوركه‌وتنه‌وه‌ی موسڵمانان له‌م سه‌ره‌ نه‌زان ونه‌فامانه‌و گه‌ڕانه‌وه‌یان بۆ لای زانایانی خواویست وباوه‌ڕ پێكراو به‌ زانست وخۆپارێزی‌یان، وه‌ وه‌كو جێبه‌جێ كردنێك بۆ فه‌رمانی خوای گه‌وره‌ كه‌ ده‌فه‌رمێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [النحل: ٤٣].

هه‌ستام به‌ كۆكردنه‌وه‌ی ئه‌م فه‌توایانه‌ی زانای خواویست وپایه‌به‌رز شێخ (محمد بن صالح العثیمين) (ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت) كه‌ تێكڕای زانایانی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ شایه‌تی‌یان داوه‌ بۆ زانیاری وزانستی سودبه‌خش وخۆپارێزی وبانگه‌وازكردنی بۆ دینی خوای گه‌وره‌، كه‌ هه‌ر له‌ته‌مه‌نی منداڵی‌یه‌وه‌ تاوه‌كو كۆچی دوایی كردووه‌ له‌ناو زانایاندا ژیانی به‌سه‌ر بردووه‌.

وه‌ ئیشی من له‌م په‌رتوكه‌دا بریتی بووه‌ له‌: كۆكردنه‌وه‌ی فه‌تواكان له‌ چه‌ند په‌رتوكێك كه‌ له‌ په‌راوێز وكۆتایی په‌رتوكه‌كه‌دا ئاماژه‌یان بۆ كراوه‌، هه‌روه‌ها دانانی ناونیشان بۆ هه‌ندێك له‌ فه‌تواكان كه‌ ناونیشانیان بۆ دانانرا بوو، وه‌ ته‌خریج كردنی ئه‌و فه‌رموودانه‌ی كه‌ ته‌خریج نه‌كرا بوون، له‌گه‌ڵ وه‌رگێڕانی فه‌تواكان، داواكارم له‌ خوای گه‌وره‌ كه‌ به‌ هۆی ئه‌م فه‌توا شه‌رعی‌یانه‌وه‌ سود به‌ موسڵمانان بگه‌یه‌نێت، وه‌ئه‌م كاره‌و سه‌رجه‌م كاره‌كانی ترمان ته‌نها له‌به‌ر ره‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌ بێت، وه‌ بیكاته‌ توێشوی قیامه‌تمان،

آمين وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

وه‌رگێڕ

دووشه‌ممه‌ به‌رواری ٢٧ی رجب١٤٢٧ك

به‌رامبه‌ر٢١/٨/٢٠٠٦ز

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين ومن تبعهم بإحسان الى يوم الدين، وبعد:**

## حوكمی تەبەڕوك كردن بە گۆڕو سوڕاندنەوە بە دەوریدا:

پ١ حوكمی تەبەڕوك كردن بە گۆڕو سوڕاندنەوە بە دەوریدا چیيە بەمەبەستی جێ بەجێ كردنی پێویستیيەكان، یاخود خۆ نزیك كردنەوە لێیان؟

و تەبەڕوك كردن بە گۆڕ حەرامەو جۆرێكە لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە، چونكە جێگیر كردنی كاریگەری شتێكی تێدایە كە خوای گەورە هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نەناردۆتە خوارەوە، هەروەها ئەم تەبەڕوك كردنە لەكارو پیشەی پێشینە چاكەكان نەبووە، كە لەم ڕووەوە دەبێتە بیدعەیش، وە ئەگەر ئەو كەسەی باوەڕی وا بێت كە مردووی ناو گۆڕ كاریگەری هەیە، یاخود توانای هەیە لەسەر لابردنی زیان، یاخود هێنانی سود ئەمە هاوبەش دانانی گەورەیە ئەگەر بۆ هێنانی سود یاخود لابردنی زیان لێی بپاڕێیتەوە.

هەروەها ئەگەر پەرستنی بۆ مردووی ناو گۆڕەكە ئەنجام دا وەكو ركوع و كڕنوش وئاژەڵ سەربڕین بۆ خۆ نزیك كردنەوە لێی و بەگەورە زانینی ئەمەیش بەهەمان شێوە هاوبەش دانانی گەورەیە، خوای گەورە دەفەرمێت: (وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾ [المؤمنون: ١١٧].

واتە: هەركەسێك لەگەڵ خوای گەورەدا لە خوایەكی تر بپاڕێتەوە ئەوا هیچ بەڵگەیەكی نيیە لەو كارەیدا (یاخود ئیشەكەی ئەو نابێتە بەڵگە بۆ هیچ كەسێكی تر)، وەحساب ولێپرسینەوەی تەنها لەلای خوای گەورەیە و خوای گەورە لێی دەپرسێتەوە، وەخوای گەورە كافران سەرفراز وسەركەوتوو ناكات.

وه ده‌فه‌رمێت: ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ [الكهف: ١١٠]

واته: هه‌ركه‌سێك به‌ ئومێدی گه‌یشتنه‌ به‌ خوای گه‌وره‌ به‌ ڕوویه‌كی سپی‌یه‌وه‌، ئه‌وا با كرده‌وه‌ی چاك ئه‌نجام بدات (واته: كرده‌وه‌كانی له‌سه‌ر سوننه‌ت بێت وبیدعه‌ نه‌كات)، وه‌ هیچ كه‌سێك نه‌كات به‌ هاوبه‌ش بۆ خوای گه‌وره‌ له‌ په‌رستندا (واته: نیه‌تی پاك بێت له‌ كرده‌وه‌كانیدا و ته‌نها مه‌به‌ستی ڕه‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌ بێت و بۆ ڕیابازی نه‌بێت).

وه‌ هاوبه‌ش بڕیارده‌ری گه‌وره‌ كافره‌و به‌نه‌مری وهه‌میشه‌یی له‌ ئاگری دۆزه‌خدا ده‌مێنێته‌وه‌ وبه‌هه‌شتی لێ حه‌رامه‌، وه‌كو خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رمێت: ﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾ [المائدة: ٧٢].

واته: هه‌ركه‌سێك هاوبه‌ش بۆ خوای گه‌وره‌ بڕیار بدات ئه‌وا خوای گه‌وره‌ به‌هه‌شتی له‌سه‌ر حه‌رام و قه‌ده‌غه‌ ده‌كات، وه‌ شوێنی ئه‌و ئاگری دۆزه‌خه‌، وه‌سته‌مكاران ( هاوبه‌ش بڕیارده‌ران) هیچ پشتیوان ویارمه‌تی ده‌رێكیان نی‌یه‌ كه‌ له‌ئاگری دۆزه‌خ ڕزگاریان بكات[٨].

## حوكمی سوێند خواردن به‌ جگه‌ له‌ خوای گه‌وره‌:

پ٢ حوكمی سوێند خواردن چی‌یه‌ به‌ جگه‌ له‌ خوای گه‌وره‌؟ وه‌كو كه‌سێك كه‌ بڵێت: به‌ پێغه‌مبه‌ر، به‌ژیانت، به‌شه‌ره‌فم، به‌م ڕزقه‌، وهاوشێوه‌ی ئه‌مانه‌، وه‌كاتێك به‌رهه‌ڵستی لێ بكه‌ین له‌وه‌ڵامدا ده‌ڵێت: ئه‌مه‌ شتێكه‌ زۆر به‌ ئاسانی وه‌رمان گرتووه‌و له‌سه‌ری ڕاهاتوین.

و ئه‌گه‌ر سوێند خۆره‌كه‌ باوه‌ڕی وا بێت كه‌ سوێند پێ خوراوه‌كه‌ له‌پله‌و پایه‌دا وه‌كو خوای گه‌وره‌یه‌، ئه‌وا هاوبه‌ش بڕیاردانی گه‌وره‌یه‌و پێ‌ی ده‌بێت به‌ هاوبه‌ش بڕیارده‌ری گه‌وره‌، وه‌ئه‌گه‌ر باوه‌ڕی وانه‌بێت وبه‌گه‌وره‌ زانینی سوێند پێ خوراوه‌كه‌ له‌ دڵیدا وای لێ كردبێت كه‌ سوێندی پێ

---

٨- (فتاوى وأذكار لإتحاف الأخيار، ص٩-١٠).

بخوات به‌بێ ئه‌وه‌ی باوه‌ڕی وا بێت كه له پله‌و پایه‌دا وه‌كو خوای گه‌وره‌یه ئه‌مایان هاوبه‌ش بڕیاردانی بچوكه‌و پێ‌ی ده‌بێت به هاوبه‌ش بڕیارده‌ری بچوك، چونكه پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) ده‌فه‌رمێت: ﴿مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أشْرَكَ﴾[9].

واته: هه‌ركه‌سێك سوێند بخوات به جگه له خوای گه‌وره ئه‌وا به‌جه‌خت له‌سه‌ر كراوی‌یه‌وه كوفری كردووه، یاخود هاوبه‌شی بۆ خوای گه‌وره بڕیارداوه.

وه پێویسته به‌رهه‌ڵستی بكرێت له‌هه‌ر كه‌سێك كه ته‌به‌ڕوك ده‌كات به گۆڕ، یاخود سوێند ده‌خوات به جگه له‌خوای گه‌وره، وه ده‌بێت بۆیان ڕوون بكرێته‌وه كه ئه‌م كارانه‌ی له‌سزای خوای گه‌وره رزگاری ناكه‌ن.

وه‌كه ده‌ڵێت: ئه‌مه شتێكه زۆر به ئاسانی وه‌رمان گرتووه وله‌سه‌ری ڕاهاتوین، ئه‌م گومانه گومانی ئه‌و هاوبه‌ش بڕیارده‌رانه‌یه كه پێغه‌مبه‌رانیان به‌درۆ ده‌خسته‌وه‌و ده‌یان ووت:

﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُقْتَدُونَ﴾ [الزخرف: ٢٣] . واته: ئێمه باوك و باپیرانی خۆمان له‌سه‌ر جۆره په‌رستنێك بینیوه، وه ئێمه شوێنی شوێنه‌واری ئه‌وان ده‌كه‌وین، پێغه‌مبه‌ریش(صلى الله عليه وسلم) پێیانی فه‌رموو:

﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُمْ بِأَهْدَى مِمَّا وَجَدْتُمْ عَلَيْهِ آبَاءَكُمْ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ﴾[الزخرف: ٢٤] .

واته: ئایا ئه‌و دینه‌ی كه‌من بۆتانم هێناوه له‌لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه هیدایه‌ت ده‌رترو ڕێنمونی كه‌ر تر نی‌یه له‌وه‌ی كه له باوك وباپیرانتانه‌وه بۆتان به‌جێ ماوه؟ ئه‌وانیش له وه‌ڵامدا وتیان: ئه‌وه‌ی كه تۆ هێناوته‌و تۆی پێ نێردراوی ئێمه پێ‌ی كافرو بێ باوه‌ڕین وبه‌رهه‌ڵستی ده‌كه‌ین. خوای گه‌وره‌یش ده‌فه‌رمێت:

---

[9] – (رواه الترمذي، وصححه الشيخ الألباني في إرواء الغليل، رقم: ٢٥٦١).

﴿فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ [الزخرف: ٢٥]. واته: ئێمه تۆڵەی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وشوێن نەكەوتنی ولاسایی كردنەوەی كوێرانەی باوك و باپیرانیانمان لێ سەندن، دەی تەماشا بكەو بزانە سەرەنجامی بەدرۆخەرەوانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چۆن بوو. وەحەلاڵ نی‌یە بۆ هیچ كەسێك بەڵگە بۆ بەتاڵەكەی بهێنێتەوە بەوەی كە باوك وباپیرانی لەسەری دیوە ولەوانەوە بۆی ماوەتەوە، یاخود داب ونەریتی ئەو وایە، وهاوشێوەی ئەمانە، وە ئەگەر ئەم شتانە بكات بەبەڵگە ئەوا بەڵگەكانی لای خوای گەورە پوچەڵ وبێ بنەمایە وهیچ سودی پێ ناگەیەنێت، وە ئەو كەسانەی كە توشی ئەم شتە بوونە پێویستە تۆبە بكەن وبگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە وشوێنی حەق بكەون لە هەر كوێ‌یەك بوو، وە لەهەر كەسێكەوە بوو، وەلەهەر كاتێكدا بوو، وەداب و نەریتی نەتەوە وگەلەكەیان یاخود لۆمەی كەسە نەزانەكانیان وایان لێ نەكات كە حەق وەرنەگرن، چونكە مرۆڤی باوەڕداری ڕاستەقینە ئەوەیە كە لۆمەی لۆمەكەران وبەربەستەكان نایگەڕێنێتەوە لە دینی خوا.

خوای گەورە هەموو لایەك سەركەوتوو بكات بۆ هەموو شتێك كە ڕەزامەندی خۆی تێدا بێت، وەبمانپارێزێت لە هەموو شتێك كە تورەبوون وسزای خۆی تێدا بێت[١٠].

---

١٠- (فتاوى وأذكار لإتحاف الأخيار، ص١٠-١١).

**حوكمی سوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە:**

پ٣ حوكمی سوێند خواردن چی‌یە بە جگە لە خوای گەورە؟ لەگەڵ ئەوەی كە لێوەی گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أفلح وأبيه إن صدق)[١١]. واتە: سوێند بێت بە باوكی سەرفراز بوو ئەگەر ڕاست بكات.

و سوێند خواردن بە جگە لەخوای گەورە، وەكو كەسێك بڵێت: بەژیانت، یاخود بە ژیانم، یاخود سوێند بێت بەسەرۆك، یاخود بەگەل، هەموو ئەمانە حەرامە، بەڵكو لە هاوبەش بڕیاردانن، چونكە ئەم جۆرە بەگەورە زانینە دروست نی‌یە بۆ جگە لە خوای گەورە، وەهەركەسێك جگە لە خوای گەورە بە گەورە بزانێت كە تەنها بۆ خوای گەورە بگونجێت ئەوە هاوبەش بڕیاردانە.

بەڵام لەبەر ئەوەی سوێند خۆر باوەڕی وانی‌یە كە گەورەیی سوێند پێ خوراو وەكو گەورەیی خوای گەورە وایە، ئەمە نابێت بە هاوبەش بڕیاردانی گەورە، بەڵكو هاوبەش بڕیادانی بچوكە، بۆیە هەر كەسێك سوێندی خوارد بە جگە لە خوای گەورە ئەوا هاوبەشی بۆ خوای گەور داناوە هاوبەش دانانێكی بچوك.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت:(لا تَحْلِفُوا بِآبائِكُمْ، مَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ أو لِيَصْمُتْ)[١٢] . واتە: سوێند بەباوك وباپیرانتان مەخۆن، وەهەركەسێك ویستی سوێند بخوات ئەوا با بە خوای گەورە سوێند بخوات، یاخود بێ دەنگ بێت وسوێند نەخوات. وەدەفەرمێت: ( مَنْ حَلَفَ بِغَيرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أشْرَكَ)[١٣].

---

١١- (سنن أبي داود: ١/١٠٧، ٣/٢٢٣، قال الشيخ الألباني شاذ بزيادة وأبيه).

١٢- (متفق عليه، وانظر: صحيح الترغيب والترهيب: ٣/ ٢٩٥١).

١٣- (رواه الترمذي، وصححه الشيخ الألباني في إرواء الغليل، رقم: ٢٥٦١).

واته: هەركەسێك سوێند بخوات بە جگە لە خوای گەورە ئەوا بەجەخت لەسەر كراویەوە كوفری كردووە، یاخود هاوبەشی بۆ خوای گەورە بڕیارداوە.

بۆیە سوێند مەخۆ بە جگە لە خوای گەورە ئەگەر سوێند پێ خوراوەكە هەر كەسێك بوو ، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش بوو یاخود جبریل بوو یاخود لەوان پلەو پایەی نزمتر بوو، لە پێغەمبەران یاخود فریشتەكان یاخود لە مرۆڤەكان، یاخود لە خوار پێغەمبەرانەوە، سوێند مەخۆ بە هیچ كەس و شتێك جگە لە خوای گەورە.

بەڵام فەرموودەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە دەفەرمێت: (أفلح وأبيه إن صدق).

دەربارەی ئەم وشەیە(وأبيه) واتە: سوێند بە باوكی، فەرمودەناسان بۆچونیان جیاوازە، هەیانە بەرهەڵستی لێ كردووەو ووتویەتی بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) نەهاتووە، بە گوێرەی ئەم بۆچونە هیچ ئاڵۆزیەك لەم بابەتەدا نیە، چونكە تۆ كاتێك باسی شتێك دەكەیت و وەڵامی دەدەیتەوە دەبێت ئەو شتە بوونی هەبێت، وەئەگەر بوونی نەبوو ئەوا بەرگری پێ ناكرێت وئاوڕی لێ نادرێتەوە.

وەئەگەر بڵێین ئەم وشەیە(وأبيه) جێگیرە، ئەوا وەڵامەكەی بەم شێوەیەیە:

ئەم وشەیە ئاڵۆزو نادیارە(مشكل)ە، وسوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە ئاشكرایە(محكم)، واتە: (محكم) و(متشابه) مان هەیە، وە ڕێگای زانا دامەزراوەكان لە زانیاریدا وایە كە واز لە(متشابه) بهێنن و (محكم) وەربگرن وكاری پێ بكەن، خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا﴾ [آل عمران: ٧].

واته‌: خوای گه‌وره‌ ئه‌و خوایه‌یه‌ كه‌ ئه‌و قورئانه‌ی دابه‌زاندۆته‌ سه‌رت ئه‌ی محمد(صلى الله عليه وسلم) له‌ قورئاندا هه‌ندێك له‌ ئایه‌ته‌كانی (محكم)ن، واته‌: (یه‌ك ڕاڤه‌ كردنیان هه‌یه‌، وه‌ ماناكه‌یان دیاره‌و ئاشكرایه‌، وه‌ بواری گۆڕینی ماناو لادانو شاردنه‌وه‌و دوو دڵی تێدا نی‌یه‌)، كه‌ ئه‌م ئایه‌تانه‌ بنچینه‌ی قورئانن و پشتیان پێ ده‌به‌سترێت، وئه‌و ئایه‌تانه‌ی پێچه‌وانه‌یان بێت ده‌گه‌ڕێنرێنه‌وه‌ بۆ ئه‌م ئایه‌تانه‌، وه‌ هه‌ندێك ئایه‌تی تری قورئان (متشابه)ن، واته‌: (زیاتر له‌ یه‌ك ڕاڤه‌كردنیان هه‌یه‌، وه‌ بواری گۆڕینی ماناو لادانو شاردنه‌وه‌یان هه‌یه‌)، فه‌رمانمان پێ كراوه‌ به‌ باوه‌ڕهێنان به‌ ئایه‌تی (متشابه)و ئیش كردن به‌ ئایاتی (محكم) به‌ڵام ئه‌وانه‌ی لادان له‌ حه‌ق له‌دڵیاندایه‌ شوێنی ئایه‌تی متشابه‌ ده‌كه‌ون، وه‌ گومان بۆ باوه‌ڕداران دروست ده‌كه‌ن و ده‌یكه‌ن به‌ به‌ڵگه‌ بۆ ئه‌و بیدعه‌یه‌ی كه‌ خۆیان له‌ سه‌رین كه‌ مه‌به‌ستیان ئه‌وه‌یه‌ خه‌ڵكی تووشی فیتنه‌ بكه‌ن له‌ دینه‌كه‌یانداو دڵیان تێك بده‌ن، وه‌ مه‌به‌ستیان ڕاڤه‌ كردنێتی به‌و شێوه‌یه‌ی كه‌ خۆیان ده‌یانه‌وێت و بگونجێت له‌گه‌ڵ ڕێگه‌ خراپه‌كه‌یاندا له‌ كاتێكدا هیچ كه‌سێك له‌ ڕاڤه‌كردنه‌كه‌ی نازانێت ته‌نها خوای گه‌وره‌ نه‌بێت، وه‌ ئه‌وانه‌ی كه‌ دامه‌زراون له‌ زانستدا ده‌ڵێن باوه‌ڕمان پێ‌ی هه‌یه‌ هه‌مووی له‌ لایه‌نی په‌روه‌ردگارمانه‌وه‌یه‌.

وه‌كه‌ ده‌ڵێین (متشابه)ه‌، مانای وایه‌ ئه‌گه‌رێكی زۆری هه‌یه‌، له‌وانه‌یه‌ ئه‌مه‌ پێش قه‌ده‌غه‌ كردنی بێت، وه‌له‌وانه‌یه‌ تایبه‌ت بێت به‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌(صلى الله عليه وسلم) له‌به‌ر دووری هاوبه‌ش بڕیاردان له‌ حه‌قی ئه‌ودا، وه‌له‌وانه‌یه‌ ئه‌مه‌ له‌و شتانه‌ بێت كه‌به‌سه‌ر زماندا هاتبێت به‌بێ مه‌به‌ست، وه‌ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م ئه‌گه‌رانه‌ هه‌موو هه‌ن له‌سه‌ر ئه‌م وشه‌یه‌(وأبيه) ئه‌گه‌ر صحیح بێت له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌(صلى الله عليه وسلم) ئه‌وا پێویسته‌ له‌سه‌رمان( محكم) ه‌كه‌ وه‌ربگرین وكاری پێ بكه‌ین كه‌ بریتی‌یه‌ له‌ قه‌ده‌غه‌ كردنی سوێند خواردن به‌ جگه‌ له‌ خوای گه‌وره‌. به‌ڵام له‌وانه‌یه‌ هه‌ندێك له‌ خه‌ڵكی بڵێن:

سوێند خواردن بە جگە لە خوای گەورە دێتە سەر زمانی و قورسە لەسەری کە وازی لێ بێنێت، وەلآمی ئەمە چیە؟

دەڵێین: ئەمە ناکرێتە بەڵگە بەڵکو کۆششی نەفسی خۆت بکە لەسەر واز هێنان و دەرچون لێی .

وەلە یادمە جارێکیان بەرهەڵستیم لە پیاوێك کرد کە بلێت: بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش دەربارەی شتێك قسەی لەگەڵمدا دەکرد ووتی: بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناگەڕێمەوە سەری.

ئەم ووتنەی لەسەر ئەو بنچینەیە بوو کە دووپاتی بکاتەوە کە ناگەڕێتەوە سەر سوێند خواردن بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بەلآم هاتە سەر زمانی، دەڵێین هەوڵ بدە ئەوەندەی لە تواناتدا هەیە ئەم ووشەیە لەسەر زمانت بسڕەرەوە، چونکە هاوبەش بڕیاردانە، وە هاوبەش بڕیاردانیش ترسناکی-یەکەی زۆر گەورەیە هەرچەندە ئەگەر بچوکیش بێت، تا شێخ الإسلام إبن تیمیة( رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمێت: (هاوبەش بڕیاردان خوای گەورە لێی خۆش نابێت ئەگەر بچوکیش بێت).

وە إبن مسعود(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمێت: (لاَنْ أَحْلِفَ بِاللهِ كاذِباً أَحَبُّ إليَّ مِنْ أَنْ أَحْلِفَ بِغَيرِهِ صَادِقاً)[١٤]. واتە: ئەگەر سوێند بخۆم بەخوای گەورە بە درۆ لام خۆش ترە لەوەی کە سوێند بخۆم بە جگە لە خوای گەورە بەڕاستی.

شێخ الإسلام إبن تیمیة( رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمێت: (چونکە تاوانی هاوبەش بڕیاردان گەورەترە لە تاوانی گەورە)[١٥].

١٤- (صححه الشيخ الألباني في: إرواء الغليل: ٨/ ٢٥٦٢).

١٥- ( فتاوى مهمة لعموم الأمة: ص٦٨-٧١).

**حوكمی سهردانی كردنی گۆڕی پیاو چاكان:**

پ٤ حوكمی سهردانی كردنی گۆڕی پیاو چاكان چیيه بهمهبهستی داواكردنی لهش ساغی لێیان؟

و سهردانی كردنی گۆڕی خهڵكی به گشتی بێت، یاخود گۆڕی كهسانێك كه وا دهزانرێت پیاوچاك بوونه، بۆ ئهوهی داوای فریاكهوتن و یارمهتی و ئاسانكاری باری ژیانیان لێ بكرێت، ئهمه هاوبهش بڕیاردانی گهورهیه وخاوهنهكهی له ئایینی ئیسلام دهردهكات، خوای گهوره دهفهرمێت: ﴿وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾ [المؤمنون: ١١٧].

ئهم ئایهته پیرۆزه ئهوه دهگهیهنێت كههەركهسێك لهگهڵ خوای گهورهدا له خوایهكی تر بپاڕێتهوه، ئهوا لهم كارهیدا هیچ بهڵگهیهكی نییه، بهڵكو بهڵگهیه لهسهر گێلی ونهفامی وگومڕایی، ههروهها ههڕهشهی تێدایه بۆ ههموو كهسێك كه لهگهڵ خوای گهورهدا له خوایهكی تر بپاڕێتهوه كه دهفهرمێت: ﴿ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ﴾، ههروهها سودی ئهوهی تێدایه كه ئهو كهسهی كه له جگه له خوای گهوره دهپاڕێتهوه بهم پاڕانهوهیه ههرگیز سهركهوتوو وسهرفراز نابێت، وهسودی ئهوهیشی تێدایه كه ئهو كهسه كافره، چونكه خوای گهوره دهفهرمێت: ﴿إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾.

وه پاڕانهوه له جگه له خوای گهوره گێلی ونهفامی وگومڕاییيه، چونكه خوای گهوره دهفهرمێت: ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ﴾ [البقرة: ١٣٠]. واته: كێ ههیه له دین وڕێگا وبهرنامهی ئیبراهیم(صلى الله عليه وسلم) لابدات مهگهر كهسانێكی خۆگێل ونهزان ونهفام كردوو.

وه دهفهرمێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾[الأحقاف: ٥].

واته: كێ گومڕاتره لهو كهسهی كه له جگه له خوای گهوره دهپاڕێتهوه له كهسانێك كه تا ڕۆژی قیامهت ناتوانن وهڵامیان بدهنهوه، وه ئهوان بێ ئاگان له پاڕانهوهی ئهم خهڵكه نهزان وگومڕایه لهوان.

وەسەرسوڕهێنەر ئەوەیە کە ئەم کەسە نەزانانە بچنە سەر گۆڕی ئەو مردووانەی کە دەزانن ئەمانە تەنها لاشەیەکی رزیوی بێ گیانن ناتوانن خۆیان رزگار بکەن لەو حاڵەی کە تێیدان چ جای ئەوەی کە جگە لە خۆیان رزگار بکەن، ئەوانیش داوایان لێ دەکەن کە لە سەغڵەتی وناخۆشی رزگاریان بکەن، وداوای لابردنی ناخۆشییەکانیان لێ دەکەن.

ئەگەر مرۆڤـ بڕوانێتە حالّی ئەو کەسانە ئەوا زۆر سەرسام دەبێت، وە ئەگەر ئەو کەسانە بگەڕێنەوە سەر خۆیان و بیر بکەنەوە ئەوا گێلی ونەزانی خۆیان بۆ دەردەکەوێ، کە ئەوان لە گومڕاییەکی ئاشکرادان، داواکارین لە خوای گەورە کەتێکڕای موسڵمانان چاو ڕۆشنا بکات لە دینەکەیدا، وەڕێنمونییان بکات بۆ حەق، وەدامەزراویان بکات لەسەری.

وەمن بەو جۆرە کەسانە دەڵێم: پاڕانەوەیەکی سودبەخش بپاڕێنەوە کەوا پەنا بەرن بۆ خوای گەورە، چونکە هەر ئەو وەڵامی لێقەوماوان دەداتەوە کاتێك کە لێی دەپاڕێنەوە، وەهەر ئەو دەردو بەڵاو ناخۆشییان لەسەر لادەبات، وە موڵکی هەموو شتێك هەر بەدەستی ئەوە، وەهەر ئەوە کە بە پێغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ [البقرة: ١٨٦]. واتە: ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بەندەکانی من پرسیاری منیان لێت کرد ئەوا من لێیانەوە نزیکم( بەزانیاری وبیستن و بینین وتواناو دەسەڵات و ویست)، وەوەڵامی دوعاو پاڕانەوەی ئەو کەسانە دەدەمەوە کە لێم دەپاڕێنەوە(یاخود داوای چییان کردووە بۆیان جێبەجێ دەکات، یاخود لە قیامەتدا پاداشتیان دەداتەوە، یاخود لەدونیادا بایی پاڕانەوەکەیان بەڵاو ناخۆشییان لەسەر لادەبات)، بەڵام بەو مەرجەی کە ئەوانیش وەڵامی بانگەوازی من بدەنەوە وباوەڕم پێ بهێنن بەڵکو دەچنە سەر ڕێگای ڕاست.

وه با ئەو كەسانه خۆيان تاقی بكەنەوه كاتێك كه ڕوو دەكەنه خوای گەوره و بەڕاستی و دڵسۆزی پەنای بۆ دەبەن، یاخود به پێویستی و ئومێدی وەڵامدانەوه، تا بۆيان دەركەوێت كه هیچ كەسێك سوديان پێ ناگەیەنێت تەنها خوای گەوره نەبێت.

وه ئەگەر بڵێن: جاری وا هەیه ئەو كەسانه دوعا دەكەن له خاوەنی ئەو گۆڕانەی كەوا گومان دەبەن پیاو چاكن، پاشان به قەزاو قەدەری خوای گەوره داواكاریيەكانيان بۆ جێبەجێ دەبێت، ئایا ئێمه هەڵوێستمان چۆن بێت سەبارەت بەم ڕووداوه؟

وەڵام: هەڵوێستی ئێمه ئەوەیه كه ئێمه دەزانین و دڵنیاین كه ئەوەی بۆ ئەوان ڕووی داوه له خاوەنی گۆڕەكانەوه نییه، وه بەهۆی پاڕانەوەی ئەوانەوه له گۆڕەكان نییه، چونكه خوای گەوره دەفەرمێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ﴾ [الأحقاف: ٥].

واته: كێ گومڕاتره لەو كەسەی كه له جگه له خوای گەوره دەپاڕێتەوه له كەسانێك كه تا ڕۆژی قیامەت ناتوانن وەڵامیان بدەنەوه، وه ئەوان بێ ئاگان له پاڕانەوەی ئەم خەڵكه نەزان وگومڕایانه لەوان.

وه خاوەنی ئەو گۆڕانه ناتوانن نه سوديان پێ بگەیەنن، وه نەزیانیشیان لەسەر لادەن، وەكو خوای گەوره دەفەرمێت: ﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ [النحل: ٢٠-٢١].

واته: ئەوانەی كه جگه له خوای گەوره خەڵكی لێيان دەپاڕێتەوه توانای دروست كردنی هیچ شتێكيان نییه، بەڵكو خۆيان دروست كراون، وه ئێستا ئەوان مردون وزیندوو نین، وه خۆيشيان هەست ناكەن كه خوای گەوره چ كاتێك زیندوويان دەكاتەوه.

ئه‌م مردووانه‌ ناتوانن هیچ شتێكیان بۆ بكه‌ن به‌ ده‌قی قورئان و سوننه‌ت و یه‌كده‌نگی زانایانی موسڵمانان، به‌ڵام ئه‌وه‌ی كه‌ بۆیان جێبه‌جێ بووه‌ له‌كاتی پاڕانه‌وه‌یان له‌ مردووه‌كان تاقی كردنه‌وه‌یه‌كه‌ له‌ خوای گه‌وره‌وه‌ ئه‌وانی پێ تاقی ده‌كاته‌وه‌، جاری وا هه‌یه‌ خوای گه‌وره‌ به‌نده‌كانی تاقی ده‌كاته‌وه‌ به‌وه‌ی كه‌ هۆكاره‌كانی تاوان كردنیان بۆ ئاسان ده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی تاقی‌یان بكاته‌وه‌، ئایا نابینیت خوای گه‌وره‌ به‌چی به‌نی ئیسرائیلی تاقی كردووه‌؟ كاتێك كه‌ ڕاوكردنی ماسی لێ حه‌رام كردن له‌ ڕۆژی شه‌ممه‌دا، وه‌ له‌و ڕۆژه‌دا ماسی‌یه‌كان گه‌لێك زۆر ده‌بوون وله‌ زۆریدا سه‌ر ئاو ده‌كه‌وتن، به‌ لام له‌ ڕۆژانی تری جگه‌ له‌ شه‌ممه‌ ماسی‌یان نابینی، ئه‌مان له‌م تاقی كردنه‌وه‌یه‌دا ده‌رنه‌چون وپه‌نایان بۆ فێڵ كردنێك برد ئه‌ویش ئه‌وه‌ بوو كه‌ له‌ ڕۆژی هه‌ینی تۆڕپان ده‌خسته‌ ناو ئاوه‌كه‌ تا ڕۆژی شه‌ممه‌ ماسی زۆریان بۆ بگرێت، به‌ڵام له‌ شه‌ممه‌دا ده‌ریان ناكرد وده‌ستیان لێ نادا، له‌ ڕۆژی یه‌ك شه‌ممه‌دا ماسی‌یه‌كانیان ده‌رده‌كرد، خوای گه‌وره‌یش پێی فه‌رموون: ﴿ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾ [الأعراف: ١٦٦]. واته‌: ببن به‌ مه‌یمونی بێ ڕێزی زه‌لیل له‌ سزای ئه‌و كاره‌ ناهه‌مواره‌تاندا.

وه‌كو خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رمێت:

﴿وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَلِكَ نَبْلُوهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ [الأعراف: ١٦٣].

واته‌: ئه‌ی محمد(صلى الله عليه وسلم) پرسیار له‌ جوله‌كاكان بكه‌ (وه‌كو یادكردنه‌وه‌یان به‌وه‌ی كه‌ به‌سه‌ر پێشینه‌كانیاندا ڕوویدا كاتێك كه‌ خوای گه‌وره‌ كردیانی به‌ مه‌یمون وبه‌راز به‌ هۆی یاری كردنیان به‌ دینه‌كه‌ی وفێڵ كردنیان)، ده‌رباره‌ی ئه‌و دێیه‌ی كه‌ به‌ ته‌نیشت ڕوباره‌كه‌وه‌ بوو(دێی آيلة ی ته‌نیشت عقبة) كاتێك سنوری خوای گه‌وره‌یان به‌زاند، به‌وه‌ی كه‌ له‌ ڕۆژی شه‌ممه‌دا ڕاوی ماسیان ده‌كرد كه‌قه‌ده‌غه‌ كرابوو لێیان له‌و ڕۆژدا، وه‌ خوای گه‌وره‌ به‌وه‌ تاقی كردنه‌وه‌ كه‌ له‌ ڕۆژی

شه‌ممه‌دا ماسی‌یه‌كان سه‌ر ئاو ده‌كه‌وتن ودیارو ئاشكراو زۆر بوون، و به‌ئاسانی راو ده‌كران، به‌ڵام له رۆژه‌كانی تردا كه دروست بوو بۆیان راو بكه‌ن ماسی‌یه‌كان ناهاتن وتوانای راوكردنیانیان نه‌بوو، خوای گه‌وره به‌م شێوه‌یه تاقی كردنه‌وه به‌هۆی خراپه‌و تاوان و له‌رێ ده‌رچونی خۆیان تا خوای گه‌وره بزانێت تا چ راده‌یه‌ك ئارام ده‌گرن.

**هه‌روه‌ها ده‌فه‌رمێت:** ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَوْا مِنْكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ فَجَعَلْنَاهَا نَكَالًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ﴾ [البقرة: ٦٥-٦٦].

واته: به دڵنیایی‌یه‌وه ئێوه به‌سه‌رهاتی ئه‌و كه‌سانه‌تان زانی كه له ئێوه (جوله‌كه‌كان) سنوری خوای گه‌وره‌یان به‌زاند له رۆژی شه‌ممه‌دا كه فێڵیان كرد(رۆژی هه‌ینی تۆڕیان ده‌خسته ناو ئاوه‌كه و رۆژی یه‌ك شه‌ممه ده‌ریان ده‌كرد، یاخود رۆژانی شه‌ممه جۆگه‌یان لێ ده‌دا تا ماسی زۆر ده‌چونه ناوی‌یه‌وه، پاشان به‌ربه‌ستیان ده‌كردو له رۆژی یه‌ك شه‌ممه ده‌ریان ده‌كرد).

خوای گه‌وره‌یش له سزای ئه‌م سه‌رپێچی‌یه‌دا كردیانی به مه‌یمونی بێ رێز و زه‌لیل، وه ئه‌و دێیه‌ی كرد به په‌ندو عیبره‌ت بۆ دێیه‌كانی پێش وپاشی خۆی، وه تا ببێت به ئامۆژگاری بۆ له خوا ترسان وخۆپارێزان تا رۆژی قیامه‌ت.

پاشان ئایا نابینیت خوای گه‌وره به‌چی هاوه‌ڵانی تاقی كرده‌وه كاتێك كه له ئیحرامدا بوون؟ خوای گه‌وره فه‌رمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ﴾ [المائدة: ٩٤].

واته: ئه‌ی باوه‌ڕداران خوای گه‌وره تاقی‌تان ده‌كاته‌وه به شتێك له راوكردن(كه له‌كاتی ئیحرامدا له حه‌ره‌مدا لێی قه‌ده‌غه كردن، هه‌روه‌كو چۆن له جوله‌كه‌كانی قه‌ده‌غه كرد له رۆژی شه‌ممه‌دا) له‌م كات وشوێنه‌دا خوای گه‌وره تاقی‌یانی كرده‌وه كه راوكردنی بۆ ئاسان كردبوون به شێوه‌یه‌ك كه ده‌یانتوانی به‌ده‌ست و رمه‌كانیان راو بكه‌ن ، به‌بێ ئه‌وه‌ی كه پێویستیان به تیر و راونان و

دواکەوتنیان بێت، بۆ ئەوەی خوای گەورە بزانێت کێ لە ئێوە لە نهێنیدا لە خوای گەورە دەترسێت، هەروەکو چۆن لەبەر چاو خەڵکی لێی دەترسێت.( بەڵام هاوەڵان وەکو جولەکەکان نەبوون و لەم تاقی کردنەوەیەدا دەرچون و سنوری خوای گەورەیان نەبەزاند هەرچەندە زۆر پێویستیشیان بوو لەبەر خۆپارێزی و لە خوا ترسانیان.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەو هاوبەش بڕیاردەرانەی کە دوعا لەو گۆڕانە دەکەن، پاشان بەقەزاو قەدەری خوای گەورە ئەوەی داوایان کردووە بۆیان جێبەجێ دەبێت، ئەمە بەبێ گومان تاقی کردنەوەیەکە لەلایەن خوای گەورەوە تاقی‌یان دەکاتەوە.

داواکارین لە خوای گەورە حەقمان بە حەق نیشان بدات و شوێنکەوتنیمان پێ ببەخشێت، وبەتاڵیشمان بەبەتاڵ نیشان بدات و دورکەوتنەوەیمان پێ ببەخشێت[١٦].

## حوکمی قورئان خوێندن لەسەر گۆڕ:

پ٥ حوکمی قورئان خوێندن چی‌یە لەسەر گۆڕ ئایا دروستە یان نا؟

و قورئان خوێندن لەسەر گۆڕ دروست نی‌یە وبیدعەیە، وە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) زانا ترین کەس بووە بە شەریعەتی خوا، وە زانا ترین کەس بووە بەوەی کە ووتویەتی، وە زاناترینو پاراو ترین کەس بووە لەوەی دەری بڕیووە، وە لەهەموو کەس ئامۆژگاری زیاتر کردووە لەوەی کە ویستوویەتی، ئەوە کە

دەفەرمێت: ﴿كُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾[١٧]. واتە: هەموو بیدعەیەك گومڕایی‌یە.

وە ئەم ڕستە گشتی‌یە کۆگیرە هیچ شتێکی لێ جیا ناکرێتەوە ودەرناکرێت، وە هەموو بیدعەیەك گومڕایی‌یە بەم دەقە(محكم)ە ڕەوانبێژە کە ئەگەر کەسێك بیەوێت درێژەی پێ بدات و ڕوونی

---

١٦- ( فتاوى مهمة لعموم الأمة: ص٧٥-٨٠).

١٧- ( صححه الشيخ الألباني في: سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٦/ ٢٧٣٥).

بكاتەوە ئەوا پەرتووكێكی گەورەی دەوێت، بۆیە قورئان خوێندن لەسەر گۆڕ بیدعەیە ولەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) نەبووە، وە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەم شتەی نەكردووە بە سوونەت نەبە ووتەی، نەبە كردەوەی نە بە بێدەنگ بوون و ڕازی بوونی، بەڵكو ڕێنمونی ئوممەتەكەی دەكرد بۆ ئەم شتە دەیفەرموو بڵێن: ﴿ السَّلامُ عَلَيكُمْ دارَ قَومٍ مُؤْمِنِين، وإنَّا إنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاحِقُون، يَرْحَمُ اللهُ المسْتَقْدِمِينَ مِنا ومِنْكُمْ والمسْتَأْخِرِين، نَسْأَلُ اللهَ لنا ولَكُمُ العافِيةَ، اللّهُمَّ لا تَحْرِمْنا أجْرَهُمْ ولا تَفْتِنا بعدَهُم، واغْفِرْ لَنا ولَهُم﴾[١٨].

واتە: سەلامی خوای گەورەتان لێ بێت ئەی خەڵكانی باوەڕداری ئەم گۆڕستانە، ئێمەش إن شاء الله پێتان دەگەینو دێین بۆ لاتان، خوای گەورە ڕەحم بە ڕۆیشتوەكانو هاتووەكانی ئێمەو ئێوەش بكات، داواكاری پارێزراوین لە خوای گەورە بۆ ئێمەو ئێوەش، خوایە بێ بەشمان نەكەیت لە پاداشتیان، وە لە دوای

ئەوانیش تاقیمان نەكەیتەوە، وە لەئێمەو ئەوانیش خۆش بە[١٩].

**حوكمی تەوەسول كردن بە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم)**:**

پ٦ حوكمی تەوەسول كردن چی‌یە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)؟

و تەوەسول كردن بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چەند بەشێكە:

**یەكەم:** تەوەسول بكات بە باوەڕهێنانی بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەمە تەوەسولێكی دروستە وەكو ئەوەی بڵێت: خوایە بۆخاتر باوەڕهێنانم بەتۆ و پێغەمبەرەكەت (صلى الله عليه وسلم) لێم خۆش بە، ئەمە ئاسایی‌یەو دروستەو هیچی تێدا نی‌یە، خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەم جۆرەی كردووە كە دەفەرمێت:

---

١٨- ( صحيح الجامع الصغير، رقم: ٤٤٢١، دون (اللهم لا تحرمنا أجرهم ولا تفتنا بعدهم، واغفر لنا ولهم).

١٩- (فتاوى مهمة لعموم الأمة: ص٧٤-٧٥).

﴿رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ﴾ [آل عمران: ١٩٣]. **واته: ئهی پهروهردگارمان ئێمه گوێ بیستی بانگهوازكارێك بووین بانگهوازی دهكرد بۆ باوهڕهێنان به تۆ (واته: پێغهمبهر(**صلى الله عليه وسلم**)) ئێمهش باوهڕمان هێنا، خوایه بۆخاتری ئهم باوهڕهێنانهمان به تۆ وپێغهمبهرهكهت** (صلى الله عليه وسلم) **له تاوانهكانمان خۆش به و گوناههكانمان بسڕهوه ولهگهڵ چاكهكاراندا بمانمرێنه.**

**چونكه باوهڕهێنان به پێغهمبهر(**صلى الله عليه وسلم**) وهسیلهو هۆكارێكی شهرعی‌یه بۆ لێخۆش بوونی خوای گهوره له تاوانهكان وسڕینهوهی گوناههكان، ئهو تهوهسولی كردووه به هۆكارێكی جێگیری شهرعی. دووهم: تهوهسول كردن به پاڕانهوهی پێغهمبهر** (صلى الله عليه وسلم)**، واته: پێغهمبهر(**صلى الله عليه وسلم**) دوعای بۆ بكات و له خوا بپاڕێتهوه بۆی، ئهمیش به ههمان شێوه دروسته، بهڵام ناگونجێت تهنها له ژیانی پێغهمبهردا** (صلى الله عليه وسلم) **نهبێت، بهڵام پاش مردنی دروست نی‌یه، ههروهكو چۆن ئیمامی عومهر (خوای لێ ڕازی بێت) له پاش وهفاتی پێغهمبهر(**صلى الله عليه وسلم**) له بێ بارانیدا تهوهسولی كرد به ئیمامی عباسی(خوای لێ ڕازی بێت) مامی پێغهمبهر** (صلى الله عليه وسلم) **نهك به پێغهمبهر(**صلى الله عليه وسلم**) چونكه كۆچی دوای كردبوو، وه فهرمووی:**

﴿اللَّهُمَّ إنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إليكَ بِنَبِيِّنَا فَتُسْقِينا، وإنا نَتَوَسَّلُ إليكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا﴾[٢٠].

**واته: ئهی پهروهردگار ئێمه پێش تر تهوهسولمان دهكرد به پێغهمبهر** (صلى الله عليه وسلم) **له ژیانیدا تۆیش بارانت بۆ دهبارانین، وه ئێستا تهوهسول دهكهین به مامی پێغهمبهرهكهمان** (صلى الله عليه وسلم) **تۆیش بارانمان بۆ ببارێنه. وه فهرمانی دهكرد به ئیمامی عهباس(خوای لێ ڕازی بێت) كه ههڵسێت و لهخوا بپاڕێتهوه تا بارانیان بۆ ببارێنێت.**

---

٢٠- (رواه البخاري، وانظر: مشكاة المصابيح: ١/ [١٣](١٥٠٩).

بۆیه ته‌وه‌سول كردن له ژیانی پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) به پاڕانه‌وه‌كه‌ی دروسته‌و هیچ شتێكی تێدا نی‌یه.

**سێیه‌م:** ته‌وه‌سول كردن به‌خاتری پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) ئیتر له ژیاندا بێت یاخود مرد بێت جیاوازی نی‌یه‌و ته‌وه‌سولێكی بیدعی‌یه‌و دروست نی‌یه، چونكه خاتری پێغه‌مبه‌ر كه‌س سودی لێ نابینێت ته‌نها خۆی نه‌بێت، بۆیه دروست نی‌یه بۆ مرۆڤـ بڵێت: خوایه بۆ خاتری پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ت (صلى الله عليه وسلم) لێم خۆش به، یاخود فلانه شتم پێ ببه‌خشه، چونكه وه‌سیله ده‌بێت هۆكار بێت، وه وه‌سیله له‌(وسل)ه‌وه وه‌رگیراوه به مانای گه‌یشتن به شتێك.

بۆیه ده‌بێت وه‌سیله‌كه بتگه‌یه‌نێت به شته‌كه، وه ئه‌گه‌ر نه‌تی گه‌یاند به شته‌كه ئه‌وا وه‌سیله‌یه‌كی بێ سووده.

له‌سه‌ر ئه‌م بنچینه‌یه ده‌ڵێین: ته‌وه‌سول كردن به پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) سێ به‌شه:

**به‌شی یه‌كه‌م:** ته‌وه‌سول كردن به باوه‌ڕ هێنان پێی و شوێن كه‌وتنی، ئه‌مه دروسته له ژیانی و له‌پاش مردنی.

**به‌شی دووه‌م:** ته‌وه‌سول كردن به پاڕانه‌وه‌ی، واته: داوا له پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) بكات دوعای بۆ بكات، ئه‌مه‌یان له ژیانیدا دروسته نه‌ك له پاش مردنی چونكه له‌پاش مردنی ناگونجێت‌و ناشێت. **به‌شی سێیه‌م:** ته‌وه‌سول كردن به خاتر و پله‌و پایه‌ی پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) له لای خوای گه‌وره، ئه‌مه‌یان دروست نی‌یه نه له‌ژیانیدا وه نه‌له پاش مردنی، چونكه وه‌سیله نی‌یه ومرۆڤـ ناگه‌یه‌نێت به مه‌به‌ستی چونكه له كرده‌وه‌ی خۆی نی‌یه. ئه‌گه‌ر كه‌سێك بڵێت: هاتوم بۆ لای پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) لای گۆڕه‌كه‌ی، وه داوام لێ كردووه داوای لێخۆشبوونم بۆ بكات له خوای گه‌وره ئایا ئه‌م شته دروسته یان نا؟

دەڵێین: دروست نی‌یه، ئەگەر بڵێت: ئەوه نی‌یه خوای گەوره دەفەرمێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾ [النساء: ٦٤].

واته: كاتێك كه ستەم له خۆیان دەكەن‌و تاوان ئەنجام دەدەن و حوكم بۆ لای جگه له خوای گەوره دەبەن، ئەگەر بێن بۆ لای تۆ ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) وداوای لێخۆشبوون له خوای گەوره بكەن‌و تۆیش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بكەیت له خوای گەوره ئەوا دەبینن خوای گەوره لێخۆشبوو به بەزەیی‌یه.

پێی دەڵێین: بەڵێ خوای گەوره وا دەفەرمێت، بەڵام دەفەرمێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا﴾. وه ئەم﴿إِذْ﴾ه بۆ ڕابردووه نەك بۆ داهاتوو، خوای گەوره نەیفەرمووه: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذَا ظَلَمُوا﴾. بەڵكو فەرموویەتی: ﴿ إِذْ ظَلَمُوا﴾، ئایەتەكه باسی شتێك دەكات كه له ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕوویداوه، وه داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) له پاش مردنی شتێكی نەشیاو ونەگونجاوه، چونكه ئەگەر مرۆڤـ بمرێت هەموو كردەوەكانی دەبچڕێت تەنها سێ شت نەبێت: سەدەقەو خێرێكی نەبڕاوه، یاخود زانیاری‌یەكی بەسود، یاخود منداڵێكی چاك لەپاش خۆی دوعای خێری بۆ بكات. هەروەكو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (صَدَقَةٌ جَارِيَة، أو عِلْمٌ يُنْتَفَعُ بِهِ، أو وَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ)[٢١] .بۆیه گونجاو نی‌یەو ناشێت هیچ مرۆڤێك له پاش مردنی داوای لێخۆشبون بۆ كەس بكات، بەڵكو تەنانەت داوای لێخۆشبوون بۆ خۆیشی بكات، چونكه كردەوەكانی بچڕاوه[٢٢].

---

٢١- (صحيح الجامع الصغير: ١/ ٧٩٣).

٢٢- (فتاوى مهمة لعموم الأمة: ص٩٩-١٠٢).

**حوكمی دواكه‌وتن له كاتی دیاری كراوی كاركردن:**

پ٧ ئێمه چه‌ند مامۆستایه‌كی ئافره‌تین تێبینی ده‌كه‌ین زۆرێك له مامۆستایانی تر دوا ده‌كه‌ون له چونه ژووره‌وه بۆ پۆله‌كان له كاتی دیاری كراودا، داده‌نیشن له‌گه‌ڵ یه‌كتریدا له ژووره‌كه‌یاندا به بێ هیچ پێویستی‌یه‌ك ئایا حوكمی ئه‌مه چی‌یه؟

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی هه‌مان كێشه‌مان بیستووه له‌لای مامۆستایانی پیاویش، خوا پاداشتی خێرتان بداته‌وه.

و ئه‌مه كارێكی حه‌رامه، دروست نی‌یه بۆ مامۆستایانی ژن وپیاو دوا بكه‌ون له چونه ژووره‌وه‌ی پۆل له‌پاش زه‌نگ لێدان، چونكه خوای گه‌وره ده‌فه‌رمێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ [المائدة: ١]. واته: ئه‌ی باوه‌ڕداران وه‌فاتان هه‌بێت به‌رامبه‌ر ئه‌و به‌ڵێن وپه‌یمانانه‌ی كه‌داوتانه و جیٚ به‌جێی بكه‌ن له كاتی دیاری كراوی خۆیدا.

وه ده‌فه‌رمێت: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا﴾ [الإسراء: ٣٤] . واته: وه‌فاتان هه‌بێت به‌رامبه‌ر په‌یمانه‌كانتان وبیبه‌نه سه‌ر، چونكه ئێوه لێتان ده‌پرسرێته‌وه له‌و په‌یمانانه‌ی كه داوتانه ونه‌تان بردۆته سه‌ر.

وه ده‌فه‌رمێت: ﴿ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ [الحجرات: ٩]. واته: ئێوه له‌هه‌موو كارو بارێكتاندا دادپه‌روه‌ربن، چونكه به ڕاستی خوای گه‌وره دادپه‌روه‌رانی خۆش ده‌وێت.

وه له دادپه‌روه‌ری نی‌یه كه فه‌رمانبه‌ر ئه‌گه‌ر مامۆستای پیاو بێت یاخود ئافره‌ت، یاخود جگه له مامۆستا موچه‌كه‌ی خۆی به ته‌واوی وه‌ربگرێت و كه‌مته‌رخه‌می بكات له جیٚ به‌جیٚ كردنی ئه‌و فه‌رمانی كه له به‌رامبه‌ریدا ئه‌و موچه‌یه‌ی بۆ دانراوه، گه‌ر كه‌مته‌رخه‌می لێوه‌ی ڕوویدا ئه‌وا باچاوه‌ڕوانی هه‌ڕه‌شه‌ی سه‌خت بێت له‌م فه‌رمووده‌یه‌ی خوای گه‌وره كه ده‌فه‌رمێت:

﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ﴾ [المطففين: ١-٣].

واته: هه‌ڕه‌شه‌و سزا بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه فێڵ ده‌كه‌ن له كێشانه‌و پێوانه‌دا و مافی خه‌ڵكی به ته‌واوی ناده‌ن و لێی كه‌م ده‌كه‌ن، كاتێك كه شت بۆ خۆیان بكڕن به ته‌واوی ده‌یكێشن‌و ده‌یپێون، به‌ڵام بۆ جگه له خۆیان بكێشن‌و بپێون كه‌می ده‌كه‌ن(٢٣).

**كۆبوونه‌وه له ماڵی مردوو به‌مه‌به‌ستی سه‌رخۆشی كردن:**

پ٨ له پاش به خاك سپاردنی مردوه‌كه‌و سه‌رخۆشی كردن له كه‌س‌و كاری خه‌ڵكی هه‌ڵده‌ستن به چون بۆ ماڵی مردووه‌كه، وه زۆر جار له پاش نوێژی ئێواره ده‌چن، پاشان قاوه ده‌خۆنه‌وه وجارێكی تر سه‌رخۆشی له كه‌س‌و كاری مردووه‌كه ده‌كه‌ن وپاشان ده‌ڕۆن، حوكمی ئه‌م كاره چی-یه؟

و ئه‌مه كارێكی بیدعه‌یه هاوه‌ڵان (خوایان لێ رازی بێت) نه له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) وه نه له پاشی له ماڵه‌كانیان چاوه‌ڕوانی خه‌ڵكیان ناكرد بۆ سه‌رخۆشی كردن لێیان، له ڕاستیدا ئه‌مه وا ده‌رده‌خات كه ئه‌و كه‌سه ناڕازی‌یه له به‌ڵاكه، وه‌ك ئه‌وه‌ی بڵێت: خه‌ڵكینه من له ماڵی خۆم به خه‌فه‌تباری دانیشتووم وه‌رن سه‌رخۆشیم لێ بكه‌ن، سوننه‌ت وایه مرۆڤـ ماڵه‌كه‌ی داخات پاشان هه‌ركه‌سێك له بازاڕ بینی، یاخود له مزگه‌وت بینی سه‌ره‌خۆشی لێ بكات كه ده‌یبینێت خه‌فه‌تباره دڵی بداته‌وه به سه‌ره‌خۆشی كردن وپێی بڵێت: ﴿إنَّ للهِ ما أخَذَ، وَلَهُ ما أعْطَى، وكُل شيءٍ عندَهُ بِأجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ﴾(٢٤).

---

٢٣- (إجابات مفيدة وتوجيهات سديدة: ص١٢-١٣).

٢٤- (متفق عليه، وانظر: مشكاة المصابيح: ١/ [٢] ١٧٢٣).

واتە: ئەوەی كە خوای گەورە بردۆتیەوەو ئەوەی كە داوێتی هەموی موڵكی خۆیەتی، وە هەموو شتێكیش لە لای ئەو كاتێكی دیاری كراوی خۆی هەیە، بۆیە ئارام بگرەو چاوەڕوانی پاداشت بە لە خوای گەورە[٢٥].

**دەف لێدان لە زەماوەندا:**

پ٩ لەم دواییەدا هەڵەكان زۆر بوونە لە بۆنەكانی ئاهەنگ گێڕانی شایی‌دا لە ماڵەكان وكۆشكی ئاهەنگ گێڕان، وە بەتایبەت لە كۆشكەكاندا، وەكو دەف لێدان بە بڵندگۆ وگۆرانی ووتن لەلایەن ئافرەتانەوە و وێنەگرتنی بە كامیرای ڤیدیۆ، وە لەمانە ناشیرین تر پیاو ماچی ژنەكەی خۆی دەكات لەپێش چاوی خەڵكی، ئیتر كوا شەرم ولە خوا ترسان؟! وەكاتێك كە ئامۆژگاری دەكرێن لەلایەن كەسانی بە غیرەت بۆ سنورەكانی خوای گەورە، دەڵێن: فلانە زانا فەتوای بە دروستێتی دەف لێدان داوە، ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئایا هیچ مەرج وسنوری هەیە تا بۆ خەڵك روون بكرێتەوە؟ بۆ ئەوەی لە سنوری خۆیان راوەستن، داوا لەبەڕێزتان دەكەین لەم بابەتەدا ئەوەی حەق بێت بۆ موسڵمانانی روون بكەنەوە خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە.

و ئەوەی كە راستی بێت لە دەف لێداندا لەكاتی ژن هێناندا ئەوەیە كە دروستە، یاخود سوننەتە ئەگەر بۆ راگەیاندنی ژن هێنانەكە بێت، بەچەند مەرجێك:

**مەرجی یەكەم:** لێدانەكە بە دەف بێت ئەوەی كە یەك دیوی گیراوە، چونكە ئەوەی كە هەردوو دیوی گیراوە پێی دەوترێت تەپڵ، كە ئەمەیان دروست نی‌یە چونكە لە ئامێرەكانی مۆسیقایە ومۆسیقایش بەهەموو جۆرەكانی‌یەوە حەرامە، تەنها ئەوە نەبێت كە بەڵگە لەسەر حەڵاڵێتی هاتبێت ئەویش تەنها دەفە لەكاتی ئاهەنگی زەماوەندا.

---

٢٥- (إجابات مفيدة وتوجيهات سديدة: ص١٩-٢٠).

**مەرجی دووەم:** نابێت شتی حەرامی لەگەڵدا بێت، وەکو گۆرانی نزمی ئارەزوو جوڵێن، ئەمە قەدەغەیە ئەگەر دەفی لەگەڵدا بێت یان نا، وە ئەگەر لەکاتی ئاهەنگ گێڕانی زەماوەند بێت یان نا.

**مەرجی سێیەم:** بەم دەف لێدانە فیتنە روونەدات، وەکو دەرخستنی دەنگی خۆشی ئافرەتان بۆ پیاوان، ئەگەر فیتنە روویدا ئەوا دیسانەوە قەدەغەیە.

**مەرجی چوارەم:** نابێت ئەم دەف لێدانە ئازاری کەس بدات، ئەگەر ئازارو بێزارکردنی تێدا بوو ئەوا دیسانەوە قەدەغەیە، وەکو بەرز کردنەوەی دەنگەکان لەرێگای بڵندگۆوە، چونکە ئەمە ئازاری دراوسێکان وجگە لەوانیش دەدات، لەوانەی کە بەم دەنگە بێزاردەبن[٢٦]، هەروەها خاڵیش نی‌یە لە فیتنە، وەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کرد کە نوێژ کەران هەندێکیان دەنگ بەرز بکەنەوە بەسەر هەندێکیاندا لە قورئان خوێندندا چونکە تەشویشی دروست دەکردو ئازاری تێدا بوو چ جای دەنگی دەف وگۆرانی و وێنەگرتنی بە ئامێری وێنە گرتن، هیچ مرۆڤێکی ژیر گومانی لە ناشیرینیدا نی‌یەو هیچ مرۆڤێکی ژیر چ جای باوەڕدار ڕازی نابێت وێنەی کەس‌و کاری بگیرێت لە دایك وکچ وخوشك وخێزانی وجگە لەمانە بۆ ئەوەی ببێت بە شت ومەکێك ونیشانی هەموو کەسێك بدرێت، یاخود ببێتە یاری یەك وهەموو مرۆڤێکی لە ڕێ دەرچوو ڕابوێرێت بە تەماشا کردنی، وە لە هەمووی ناشیرین تر وێنەگرتنی بە کامێرای ڤیدیۆ، چونکە ئەمە وێنەی ڕووداوەکە دەگرێت بە زیندوویی بە بیستن وبینینەوە کە ئەمەیش کارێکە هەموو خاوەن عەقڵێکی ساغو دینێکی دامەزراو بەرهەڵستی دەکەن، وە بە خەیاڵدا نایات هیچ کەسێك شەرم و باوەڕی هەبێت ئەم شتە حەلاڵ بکات.  وە سەما کردنی ئافرەتان شتێکی ناشیرینە فەتوا بە دروستێتی نادەین چونکە بیستوومانە

---

٢٦- رەحمەتی خوای گەورە لە شێخی پایە بەرز بێت بۆ خۆی و فەتوای، بەڕاستی سەردەمێك بوو خەڵکی دەیان ناڵاند بەدەستی گۆرانی ومۆسیقای شایی، بەتایبەتی بەشەوان کە خەڵکی تا پاش تەواو بوونی ئاهەنگەکە نە خەویان هەبوو نەپشوو. وەرگێڕ.

بە هۆیەوە چی لەناو ئافرەتاندا ڕوویداوە، وەئەگەر لە لایەنی پیاوانەوە بێت ئەوا ناشیرین ترە، وە لە خۆ چواندنی پیاوانە بە ئافرەتان، وە ئەو خراپانەی کە تێیدایە شاراوە نییە.

وە ئەگەر لە نێوان ئافرەتان و پیاواندا بێت بە تێکەڵی هەروەکو خەڵکانی نزمو بێ ڕێز دەیکەن ئەمەیان تاوانەکەی گەورەترەو ناشیرین ترە، چونکە تێکەڵی کێشەی زۆری تێدایە بە تایبەت ئەگەر بۆنەکە بۆنەی ژن هێنان بێت.

وە ئەوەی کە پرسیارکەر باسی کرد لەوەی کە پیاوەکە دەچێتە ناو ئافرەتانەوە لەبەر چاویان ماچی ژنەکەی دەکات، ئەمە شتێکی سەیرە لە کەسێکەوە ڕوو بدات خوای گەورە بەخششی خۆی ڕژاندبێت بە سەریدا بە بەخششی ژن هێنان ئەویش ڕووبەڕووی ئەو بەخششە ببێتەوە بەم کارە لەبەرچاو ئافرەتانو لە ئاهەنگی زەماوەند کە جێگەی ئارەزووە.

پاشان چۆن کەس وکاری ژنەکە ڕێگەی پێ دەدەن؟! وە ئایا لەوە ناترسن کە ئەم پیاوە لەکۆبوونەوەی ئەو ئافرەتانە ئافرەتێکی جوانتر لە ژنەکەی خۆی ببینێت و پێی سەرسام بێت و ژنەکەی خۆی لەبەرچاو بکەوێت و مێشك و بیری سەرقاڵ بکات بە بیرکردنەوە لێی و سەرەنجامی نێوان خۆی و ژنەکەیشی باش نەبێت؟!

من کۆتایی بەوەڵامەکەم دەهێنم بە ئامۆژگاری کردنی برایانی موسڵمانم کەواز بهێنن لەم کردەوە خراپانە، وە بانگیان دەکەم بۆ هەڵسان بە سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر ئەم بەخششەو جگە لەمە، وە ڕێگای پێشینە چاکەکان بگرن و ئەوەندەی لە سوننەتدا هاتووە هەر ئەوە بکەن و شوێنی هەواو ئارەزووی کەسانێك نەکەون کە خۆیان گومڕا بوونەو خەڵکیان گومڕا کردووە وڕێگای ڕاستیان وێڵ کردووە، داواکارم لە خوای گەورە من و برایانی موسڵمانم سەرکەوتوو بکات بۆ هەموو شتێك کە

خۆشی دەوێت و لێی ڕازی‌یە، وەیارمەتیمان بدات لەسەر یادكردنەوە و سوپاس كردنی و باش پەرستنی. إنه قريب مجيب، وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين[٢٧].

## حوكمی شەرواڵ درێژی بۆ پیاوان:

پ١٠ حوكمی شەرواڵ درێژی چی‌یە بۆ پیاوان؟

و شەرواڵ درێژی بۆ پیاوان ئەگەر مەبەستی پێی خۆبەگەورە زانین و فیز كردن بێت ئەوا سزاكەی ئەوەیە كە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای ناكات و قسەی لەگەڵ ناكات و پاكی ناكاتەوەو سزایەكی بە ئێش و ئازاری دەدات.

بەڵام ئەگەر مەبەستی پێ‌ی فیزكردن و خۆهەڵكێشان نەبوو ئەوا سزاكەی ئەوەیە سزای خوار گوێزینگی (قولەپێی) بدات بە ئاگر، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت:

﴿ثلاثةٌ لايُكَلِّمُهُمُ اللهُ يومَ القيامةِ ولا يَنْظُرُ إليهِم ولا يُزَكِّيهِم ولَهُم عذابٌ أليم: المسْبِلُ، والمنَّانُ، والمنْفِقُ سِلْعَتَهُ بِالحلفِ الكاذِب﴾[٢٨]. واتە: سێ كۆمەڵ لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە نە قسەیان لەگەڵ دەكات و نە تەماشایان دەكاتو نە پاكیان دەكاتەوەو سزایەكی بە ئێشو ئازاریان هەیە: ئەو پیاوەی شەرواڵەكەی شۆڕ كردۆتەوە بۆ خوار گوێزینگی(قولەپێی)، وەمنەت كەر، وئەو كەسەی كە شتومەكەكەی دەفرۆشێت بە سوێن خواردنی درۆ.

وەدەفەرمێت: ﴿مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاء لَمْ يَنْظُرِ اللهُ إليهِ يومَ القيامة﴾[٢٩]. واتە: هەر پیاوێك شەرواڵەكەی شۆڕ بكاتەوە بۆ خوار گوێزینگی(قولەپێی) ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای ناكات.

---

٢٧- (إجابات مفيدة وتوجيهات سديدة: ص٢٨-٣٢).

٢٨- ( صححه الشيخ الألباني في: إرواء الغليل، رقم: ٩٠٠).

٢٩- (صحيح الجامع الصغير: ٢/ ٦١٨٨).

ئه‌مه‌ سزای كه‌سێكه‌ كه‌ له‌ فیزكردن وخۆ هه‌ڵكێشاندا شه‌رواڵه‌كه‌ی شۆڕ بكات، به‌ڵام ئه‌و پیاوه‌ی له‌ شۆڕكردنیدا مه‌به‌ستی فیزكردن نه‌بێت ئه‌وا پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) ده‌رباره‌ی ده‌فه‌رمێت:

﴿ما أسْفَلَ الكَعْبَين مِنَ الإزارِ فَفِي النَّارِ﴾[30].

واته‌: هه‌ر پیاوێك شه‌رواڵه‌كه‌ی له‌ خوار گوێزینگی‌یه‌وه‌(قوله‌پێ‌ی) بێت ئه‌وا ئه‌و شوێنه‌ی له‌ئاگری دۆزه‌خدایه‌.

وه‌ ئه‌م شته‌ی نه‌به‌ستۆته‌وه‌ به‌ فیز كردن وخۆ به‌گه‌وره‌ زانینه‌وه‌، وه‌ راستیش نی‌یه‌ بیبه‌ستینه‌وه‌ به‌ فیزكردن له‌سه‌ر فه‌رموده‌كه‌ی پێش تر، چونكه‌ أبوسعيد الخدري (خوای لێ ڕازی بێت) ده‌فه‌رمێت: پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فه‌رموویه‌تی: ﴿إزرَةُ المؤمِنِ إلى نِصْفِ السَّاقِ، ولا حَرَجَ، أو قالَ ولا جُناحَ عليه فِيما بَينَهُ وَبَينَ الكَعْبَينِ، وما أسْفَلَ مِنْ ذلِكَ فَهُوَ في النارِ، وَمَنْ جَرَّ إزارَهُ بَطَراً لَم يَنْظُرِ اللهُ إليهِ يومَ القيامة﴾[31]. واته‌: شه‌رواڵی پیاوی باوه‌ڕدار تا نیوه‌ی قاچێتی، وه‌تاوان نی‌یه‌ و ئاسایی‌یه‌ ئه‌گه‌ر تا گوێزینگه‌كانی(قوله‌پێ‌ی) شۆڕ بێت، به‌ڵام له‌خوار تر وشۆڕ تر بێت ئه‌وا له‌ ئاگردایه‌، وه‌ هه‌ر كه‌سێك شه‌رواڵه‌كه‌ی شۆڕ بكات له‌ فیز وخۆبه‌گه‌وره‌ زانیندا ئه‌وا خوای گه‌وره‌ له‌ رۆژی قیامه‌تدا ته‌ماشای ناكات.

وه‌ چونكه‌ دوو كرداره‌كه‌ لێك جیاوازن (ئه‌وه‌ی بۆ فیز شۆڕی ده‌كات، وئه‌وه‌ی به‌بێ فیز)، وه‌دوو سزاكه‌یشیان لێك جیاوازن (ئه‌وه‌ی بۆ فیز شۆڕی ده‌كات سزاكه‌ی ئه‌وه‌یه‌: خوای گه‌وره‌ نه‌قسه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌كات ونه‌ته‌ماشای ده‌كات ونه‌ پاكی ده‌كاته‌وه‌ وسزایه‌كی به‌ ئێش وئازاری بۆ داناوه‌، وه‌ئه‌وه‌ی كه‌ به‌بێ فیز شۆڕی ده‌كات سزاكه‌ی ئه‌وه‌یه‌: ئه‌و شوێنه‌ی له‌ ئاگری دۆزه‌خدایه‌)،

٣٠-(صحيح الجامع الصغير: ٢/ ٥٥٢٩).

٣١- (صحيح الترغيب والترهيب: ٢/ ٢٠٣١).

وه‌هه‌ركاتێك حوكم وهۆكار لێك جیاواز بوون ئه‌وا ناتوانرێت (مطلق)ه‌كه هه‌ڵگیرێت بۆ سه‌ر(مقيد)ه‌كه، چونكه دژ به‌یه‌كی دروست ده‌بێت.

به‌ڵام كه‌سێك فه‌رمووده‌كه‌ی أبوبكر[٣٢](خوای لێ ڕازی بێت) بكات به به‌ڵگه، ئه‌وا پێ ده‌ڵێین: نابێته به‌ڵگه بۆت له دوو ڕووه‌وه: **یه‌كه‌م:** أبو بكر (خوای لێ ڕازی بێت) فه‌رمووی: لایه‌كی شه‌رواڵه‌كه‌م دێته خواره‌وه مه‌گه‌ر به‌رزی بكه‌مه‌وه، پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) پێ‌ی فه‌رموو: ( إِنَّكَ لَسْتَ مِمَّنْ يَصْنَعُ ذِلِكَ خُيَلاء )[٣٣].

واته: تۆ له‌و كه‌سانه نیت كه بۆ فیز و خۆ هه‌ڵكێشان شۆڕی ده‌كه‌نه‌وه. أبو بكر (خوای لێ ڕازی بێت) بۆ فیز شۆڕی نه‌كردبووه‌وه، به‌ڵكو خۆی شۆڕده‌بووه‌وه، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یشدا به‌رزی ده‌كرده‌وه، وه‌ئه‌وانه‌ی كه شه‌رواڵه‌كانیان شۆڕ ده‌كه‌نه‌وه وده‌ڵێن: بۆ فیزو خۆ هه‌ڵكێشانمان نیه، پێیان ده‌ڵێین: ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستتان له شۆڕكردنی شه‌رواڵه‌كانتان بۆ خوار گوێزینگه‌كانتان(قوله‌پێ) فیز وخۆبه‌گه‌وره زانین نه‌بێت ئه‌وا خوای گه‌وره سزاتان ده‌دات ته‌نها به ئاگر، وه ئه‌گه‌ر به‌مه‌به‌ستی فیزو خۆ به‌گه‌وره زانین شۆڕتان كردبێته‌وه ئه‌وا سزاتان ده‌دات به‌وه گه‌وره‌تر: له‌ڕۆژی قیامه‌تدا نه‌قسه‌تان له‌گه‌ڵ ده‌كات، وه‌نه‌ته‌ماشاتان ده‌كات، وه‌نه‌پاكتان ده‌كاته‌وه، وه سزایه‌كی به ئێش و ئازارتان بۆ هه‌یه. **دووه‌م:** پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)أبو بكری (خوای لێ ڕازی بێت) پاك كرده‌وه‌و ته‌زكیه‌ی كرد وشایه‌تی بۆدا كه ئه‌و له‌و كه‌سانه نیه كه بۆ خۆبه‌گه‌وره زانین وفیز شۆڕی ده‌كه‌نه‌وه، به‌ڵام ئایا كه‌س له‌وانه‌ی وا ده‌ڵێن ئه‌م پاككردنه‌وه‌یه‌و شایه‌تیه‌ی ده‌ست كه‌وتووه‌و بۆدراوه؟!

---

٣٢- [قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): (من جر ثوبه خيلاء لم ينظر الله إليه يوم القيامة)، قال أبو بكر(رضي الله عنه): إن أحد جانبي إزارى يسترخي، إني لأتعاهد ذلك منه. قال: (لست ممن يفعله خيلاء)]. (صحيح سنن أبي داود، رقم: ٤٠٨٥).

٣٣- نفس المصدر.

به‌ڵام شه‌یتان بۆ هه‌ندێك له‌ خه‌ڵكی ده‌رگای شوێن كه‌وتنی(المتشابه) ده‌كاته‌وه‌ له‌ ده‌قه‌كانی قورئان وسوننه‌ت، بۆ ئه‌وه‌ی بیانویان بۆ بدۆزێته‌وه‌ بۆ ئه‌و كرده‌وانه‌ی كه‌ ده‌یكه‌ن.

والله يهدي من يشاء إلى صراط مستقيم[٣٤].

## تێكه‌ڵ كردنی نوێژه‌ سوننه‌ته‌كان به‌ یه‌ك نیه‌ت:

پ١١ ئایا نوێژه‌ سوننه‌ته‌كان هه‌ندێكیان ده‌چنه‌ ناو هه‌ندێكی تریانه‌وه‌؟ بۆ نمونه‌: كه‌سێك بیه‌وێت سوننه‌تی ده‌ست نوێژ ئه‌نجام بدات، ئایا ده‌توانێت نوێژی چێشت ته‌نگاویشی(ضحى) تێكه‌ڵ بكات؟ واته‌: هه‌ردوو نوێژه‌كه‌ بكات به‌یه‌ك نیه‌ت؟

و هه‌ندێك له‌ سوننه‌ته‌كان مه‌به‌ست له‌ جێبه‌جی كردنیان خودی خۆیانه‌، ئه‌مانه‌ تێكه‌ڵ ناكرێن وبه‌جیا ده‌كرێن، وه‌هه‌ندێك له‌ سوننه‌ته‌كان مه‌به‌ست له‌ جێبه‌جێ كردنیان ته‌نها كردنی نوێژه‌، بۆ نمونه‌: سوننه‌تی ده‌ست نوێژ مه‌به‌ست پێی ته‌نها ئه‌وه‌یه‌ كه‌له‌پاش ده‌ست نوێژ هه‌ڵگرتن دوو ركات نوێژ بكه‌یت، ئیتر ئایا ئه‌و دوو ركاته‌ سوننه‌تی ده‌ست نوێژ بێت، یاخود ضحى بێت، یاخود پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ بێت، یاخود پێش نوێژی به‌یانی بێت، یاخود له‌نێوانی بانگ وقامه‌تدا بێت، چونكه‌ له‌ نێوانی هه‌موو بانگ وقامه‌تێكدا دوو ركات نوێژ هه‌یه‌، هه‌روه‌ها تحية المسجد دروسته‌ بۆت كه‌ چویته‌ مزگه‌وته‌وه‌ دوو ركات بكه‌یت به‌ نیه‌تی سوننه‌تی پێش نوێژ وتحية المسجد، ئه‌مانه‌ كۆده‌كرێنه‌وه‌( واته‌: نیه‌ت له‌ دوو نوێژ بهێنیت وهه‌ردووكیان كۆ بكه‌یته‌وه‌).

به‌ڵام ئه‌گه‌ر په‌رستنه‌كه‌ مه‌به‌ست بوو خۆی جێبه‌جێ بكرێت ئه‌وا كۆناكرێته‌وه‌ وتێكه‌ڵ ناكرێت له‌گه‌ڵ نوێژی تردا، بۆیه‌ ئه‌گه‌ر كه‌سێك بڵێت: من چوار ركاته‌كه‌ی پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ كۆده‌كه‌مه‌وه‌ ونیه‌ت ده‌هێنم وبه‌دوو ركات ده‌یكه‌م، پێی ده‌ڵێین: ئه‌مه‌ ناگونجێت ودروست نی‌یه‌، چونكه‌ ئه‌م

٣٤- (إجابات مفيدة وتوجيهات سديدة: ص٣٤-٣٦).

سوننەتە لێرەدا مەبەست پێی جێبەجێ كردنی خۆیەتی، واتە: دوو ركات بكەیت پاشان دوو ركاتی تر بكەیت.

بەهەمان شێوە دوو ركاتی سوننەتی سوڕانەوە بەدەوری كەعبەدا (طواف) لەگەڵ سوننەتی پێش بەیانی، بۆ نمونە: ئەگەر كەسێك لە طواف كردن تەواو بوو لە پاش بانگی بەیانی و پێش قامەت كردن، دوو ركات بكات ونیەتی پێی دوو ركاتەكەی طواف و دوو ركاتەكەی سوننەتی بەیانی بێت، ئەوا هیچیان لە جیاتی ئەوی تریان ناكرێت ودروست نی‌یە تێكەڵ بكرێت، چونكە سوننەتی طواف سوننەتێكە مەبەست پێی جێبەجێ كردنی خۆیەتی، وە سوننەتی پێش بەیانیش سوننەتێكە مەبەست پێی جێبەجێ كردنی خۆیەتی[٣٥].

**نەخۆشی گواستنەوە:**

پ١٢ ئایا كۆكردنەوە لە نێوان ئەم دوو فەرموودەیە چۆنە (فِرْ مِنَ المجْذُومِ فِرارك مِنَ الأسَدِ)[٣٦] وە(لا عَدوى ولا طِيرة)[٣٧]؟

واتە: ( لەنەخۆشی رابكە وەك راكردنت لە شێر)، (نەخۆشی گواستنەوە وشومی نی‌یە).

و ئەگەر تێ بڕوانین لە فەرموودەكان دەبینین هیچ دژ بەیەكی‌یەك لە نێوانیاندا نی‌یە، فەرموودەی یەكەم: (فر من المجذوم) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی پێی ئەوەیە كە مرۆڤـ خۆی دوور بخاتەوە لە هۆكاری ترسناكی، وە فەرموودەی دووەم: (لا عدوى ولا طيرة) مەبەستی ئەوەیە كە روونی بكاتەوە ئەگەر وادابنێین كەسێك توشی نەخۆشی بوو لە كەسێكی ترەوە، ئەوا ئەم نەخۆشی گواستنەوەیە روویداوە بە ئیزن و رێگە پێدانی خوای گەورە، نەك وەك هەندێك لە عەرەب باوەڕیان

---

٣٥- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٢٥، ص٢٥-٢٦).

٣٦- (سلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم: ٧٨٣).

٣٧- (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢/ ٧٨٤).

وایه كه نه‌خۆشی خۆی ده‌گوازرێته‌وه، به‌ڵكو وانی‌یه و به‌فه‌رمانی خوای گه‌وره ده‌گوازرێته‌وه، بۆیه ئه‌م نه‌فی كردنه( لاعدوى ولا طيرة) مه‌به‌ست پێی نه‌فی كاریگه‌ری‌یه‌كه‌یه‌تی كه كاریگه‌ری نی‌یه به‌بێ رێگه پێدانی خوای گه‌وره، نه‌ك نه‌فی بوونی، به‌ڵكو نه‌خۆشی گواستنه‌وه بوونی هه‌یه، وه هه‌موومان ده‌زانین كه هه‌ندێك نه‌خۆشی زۆر به خێرایی ده‌گوازرێته‌وه، به‌ڵام گواستنه‌وه‌كه‌ی به فه‌رمان و رێگه پێدانی خوای گه‌وره‌یه نه‌ك له خۆیه‌وه[٣٨].

**به‌سته‌ره‌وه‌كانی بیدعه:**

پ١٣ هه‌فته‌ی رابردوو پرسیارمان كرد ده‌باره‌ی ئه‌و لافیتانه‌ی كه‌له رێگاو بان وشه‌قامه‌كاندا هه‌ڵواسراون وسبحان الله والحمد لله‌ی لێ نوسراوه یه‌كێك له ئێمه ووتی: ئه‌مه بیدعه نی‌یه؟ ئایا هاوه‌ڵان (خوایان لێ رازی بێت) ئیشی وایان كردووه؟ ئایا رێكخه‌رو به‌سته‌ره‌وه بۆ بیدعه چی‌یه؟

و بیدعه ئه‌وه‌یه كه مرۆڤ خوای گه‌وره بپه‌رستێت به شێوه‌یه‌ك كه خوای گه‌وره داینه‌نابێت و ته‌شریعی نه‌كردبێت، به‌ڵام هۆكاره‌كانی په‌رستن بیدعه نین، وه جیاوازی هه‌یه له‌نێوان مه‌به‌ست و هۆكاره‌كاندا، ئه‌گه‌ر یه‌كێك بڵێت: بڵند گۆی ده‌نگ له نوێژو ووتارو ئامۆژگاری وجگه له‌مانه له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) نه‌بووه ئه‌وا بیدعه‌یه، ئه‌وا پێی ده‌ڵێین: ئه‌مه هه‌ڵه‌یه، چونكه ئه‌مه هۆكارێكه بۆ گه‌یاندنی خێرو چاكه به‌خه‌ڵكی، وه ئه‌م لافیتانه‌ی كه له رێگه‌و بان وشه‌قامه‌كاندا هه‌یه هۆكارێكه بۆ یادخستنه‌وه‌ی خه‌ڵكی به‌یاد كردنی خوای گه‌وره، بۆیه نابینم هیچ شتێكی تێدا بێت و ئاسایی‌یه[٣٩].

---

٣٨- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٢٥، ص٢٧-٢٨).

٣٩- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٢٥، ص٣٣-٣٤).

**حه‌ج وبازرگانی كردن پێكه‌وه‌:**

پ١٤ ئایا دروسته‌ كه‌سێك بچێت بۆ مه‌ككه‌ بۆ بازرگانی كردن له‌گه‌ڵ جێبه‌جێ كردنی حه‌جدا؟

و  به‌ڵێ دروسته‌ بۆ مرۆڤـ بچێت بۆ مه‌ككه‌ به‌ نیه‌تی حه‌ج كردن وبازرگانی، چونكه‌ خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رمێت: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ﴾ [البقرة: ١٩٨].

واته‌: هیچ گوناه وتاوانێكتان له‌سه‌ر نی‌یه‌ ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ حه‌ج كردندا بازرگانی بكه‌ن، به‌ڵام پێویسته‌ لایه‌نی حه‌ج كردنه‌كه‌ زاڵ بیت به‌سه‌ر بازرگانی كردنه‌كه‌دا[٤٠].

**سوجده‌ی سه‌هو:**

پ١٥  ئایا مه‌رجه‌ بۆ پێشه‌وا سوجده‌ی سه‌هو ببات له‌ نوێژی چوار ركاتیدا ته‌نها له‌به‌ر هه‌ڵسانه‌وه‌ی، یاخود ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ خه‌ریك بووه‌ هه‌ڵسێته‌وه‌؟

و  زیاده‌ دروست نابێت ئیللا ئه‌گه‌ر روكنێك بداته‌ پاڵ ئه‌وه‌ی دوای خۆی، هه‌روه‌كو چۆن مرۆڤـ ئه‌گه‌ر به‌رز بێته‌وه‌ بۆ هه‌ڵسانه‌وه‌ بۆ ركاتی پێنجه‌م له‌ نوێژه‌ چوار ركاتی‌یه‌كاندا، پاشان یادی بكه‌وێته‌وه‌ پێش ئه‌وه‌ی به‌رز بێته‌وه‌ ئه‌وا داده‌نیشێته‌وه‌ وسوجده‌ی سه‌هوی له‌سه‌ر نی‌یه‌، چونكه‌ نه‌چووه‌ روكنه‌كه‌ی دوای ئه‌وه‌وه‌[٤١].

**ناداد په‌روه‌ری له‌ نێوان منداڵدا:**

پ١٦  پیاوێك سێ باڵه‌خانه‌ی هه‌یه‌ ودوو ژنی هه‌یه‌، له‌یه‌كێك له‌ ژنه‌كانی كچێكی هه‌یه‌، وه‌ له‌دووه‌می چه‌ند كوڕێكی هه‌یه‌، به‌نهێنی یه‌كێك له‌ باڵه‌خانه‌كانی كردۆته‌ ناو ئه‌و كچه‌یه‌وه‌ كه‌ له‌ ژنه‌كه‌ی تره‌، ئایا ئه‌م كاره‌ی دروسته‌؟

---

٤٠ -(لقاء الباب المفتوح، رقم: ٢٥، ص٣٩).

٤١ - نفس المصدر.

و ئه‌وه‌ی ئه‌و پیاوه ئه‌نجامی داوه حه‌رامه له‌سه‌ری، واته: دروست نی‌یه یه‌كێك له كوڕه‌كانی یاخود كچه‌كانی تایبه‌ت بكات به شتێك له‌ماڵه‌كه‌ی و ئه‌وانی تری لێ بێ به‌ش بكات، چونكه به‌شیری كوڕی سه‌عد (خوای لێ ڕازی بێت) شتێكی دا به نوعمانی كوڕی، ئه‌م شته گه‌یشته پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) وپرسیاری لێ كرد: ﴿هَلْ فَعَلْتَ ذلِكَ بِكُلِّ وَلَدِكَ؟﴾.

واته: ئایا ئه‌مه‌ت له‌گه‌ڵ هه‌موو منداڵه‌كانت كردووه وبه‌وانیشت داوه؟ ئه‌ویش ووتی: نه‌خێر، پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) پێی فه‌رموو: ﴿إتَّقُوا الله واعْدِلُوا بَيْنَ أولادِكُم﴾[٤٢]. واته: له خوا بترسن ودادپه‌روه‌ر بن له نێوان منداڵه‌كانتاندا.

(به‌شیر)یش(خوای لێ ڕازی بێت) له به‌خشینه‌كه‌ی بۆنوعمان گه‌ڕایه‌وه‌و لێی وه‌رگرته‌وه. بۆیه ئه‌و پیاوه ئه‌گه‌ر زیندوو بێت وپێی بگات ئه‌م كاره‌ی كردوویه‌تی حه‌رامه، ده‌بێت لێی بگه‌ڕێته‌وه وبه‌ڵێن نامه وتاپۆكه بدڕێنێت، وه ئیشه‌كه بگه‌ڕێنێته‌وه بۆ حوكمی خوای گه‌وره، وه‌ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره وای بڕیار دابێت مردبێت وكچه‌كه زیندوو بێت ئه‌وا ده‌بێت ئه‌وه‌نده‌ی شایانێتی له میراتی له دینی خوای گه‌وره‌دا ئه‌وه‌نده وه‌ربگرێت له‌گه‌ڵ براكانیدا[٤٣].

## پیرۆزبایی كردن له كافران به‌بۆنه‌ی چه‌ژنه‌كانیانه‌وه:

پ١٧ حوكمی پیرۆزبایی كردن چی‌یه له كافران به بۆنه‌ی چه‌ژنی كریسمس وچه‌ژنی سه‌ری ساڵی زایینی، چونكه ئه‌وان له‌گه‌ڵماندا كار ده‌كه‌ن؟ وه‌ئه‌گه‌ر ئه‌وان پیرۆزبایی‌یان لێ كردین به‌بۆنه‌ی چه‌ژنه‌كانیانه‌وه چۆن وه‌ڵامیان بده‌ینه‌وه؟

وه ئایا دروسته بڕۆین بۆ ئه‌و شوێنانه‌ی كه ئاهه‌نگی لێ ده‌گێڕن به‌م بۆنانه‌وه؟

---

٤٢- (البخاري: ٢٥٨٧)، و(مسلم: ١٧٢٣ [١٣]).

٤٣- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٢٥، ص٤١-٤٢).

وە ئایا مرۆڤـ تاوان بار دەبێت ئەگەر شتێك لەوانەی پێشو كەباسكرا ئەنجام بدات بەبێ مەبەست؟ بەڵكو وەكو لە ڕوودا دامان یاخود لەشەرما، یاخود لە شەرمەزاریدا یاخود جگە لەم هۆیانە؟

وە ئایا خۆ چواندن بەوان دروستە لەو بۆنانەدا؟

و پیرۆزبایی كردن لە كافران بەبۆنەی چەژنی كریسمس وجگە لەمە لە چەژنە ئایینیەكانی تریان حەرامە بەیەكدەنگی زانایان، هەروەكو چۆن إبن القيم لەپەرتوكەكەیدا( أحكام أهل الذمة) باسی دەكات ودەفەرمێت: (پیرۆزبایی كردن بە دروشمەكانی تایبەت بە كوفر حەرامە بەیەكدەنگی زانایان، وەكو ئەوەی پیرۆزبایی یان لێ بكرێت بەبۆنەی چەژن و ڕۆژووگرتنەكانیان وبوترێت: چەژنت پیرۆز بێت وهاوشێوەی ئەمانە، ئەمە ئەگەر بێژەرەكەی سەلامەت بێت لە كوفر، ئەوا لە قەدەغەكراو وحەرامەكانە، وە وەكو ئەوە وایە كە پیرۆزبایی یان لێ بكرێت بە كڕنوش بردنیان بۆ خاچەكەیان، بەڵكو ئەمە لای خوای گەورە تاوانی گەورەترو توڕەبوونی سەخت ترە لە پیرۆزبایی كردن لە مەی خواردنەوە و كوشتن وزینا كردن وهاوشێوەی ئەم تاوانانە، وەزۆرێك لەوانەی كە ڕێزی دینیان لەلا نی‌یە دەكەونە ناو ئەم تاوانانەوەو ناشیرینی كارەكەیشی نازانێت كە پیرۆزبایی لەكەسێك كردووە بە تاوان كردن یاخود بیدعە كردن یاخود كوفر كردن، وە توشی توڕەبوون وغەزەبی خوای گەورە بووە) قسەكەی تەواو بوو( رەحمەتی خوای لێ بێت). وەبۆیە پیرۆزبایی كردنی لە كافران حەرامە بەم چەشنەی كە إبن القيم باسی دەكات، چونكە دان نانی تێدایە بۆ ئەو دروشمە كوفری-یانەی كە ئەوانی لەسەرن، وە رازی بوونە بۆیان بۆ ئەو شتەی كەلەسەرین، هەرچەندە بۆ خۆی رازی نابێت بەو كوفرە بەڵام حەرامە بۆ موسڵمان كە رازی بێت بە دروشمەكانی كوفر، یاخود پیرۆزبایی پێ بكات لە خەڵكانی تر، چونكە خوای گەورە بەم شتە رازی نابێت، هەروەكو دەفەرمێت: ﴿إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ [الزمر: ٧].

واته: ئه‌گه‌ر ئێوه كافر و بێباوه‌ڕ بن ئه‌وا خوای گه‌وره هیچ پێویستی به‌ په‌رستنی ئێوه نی‌یه وبێ پێویسته لێتان، وه‌هه‌رچی له ئاسمانه‌كان وزه‌ویدایه خوای گه‌وره ده‌په‌رستن و مل كه‌چین، به‌ڵام له‌هه‌مان كاتدا خوای گه‌وره به كوفر رازی نابێت بۆ به‌نده‌كانی، وه‌ئه‌گه‌ر ئێوه سوپاس گوزاری بكه‌ن ئه‌وا رازی ده‌بێت لێتان.

وه‌ده‌فه‌رمێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ [المائدة: ٣].

واته: ئه‌مرۆ من دینه‌كه‌م بۆتان ته‌واو كرد وبه‌خششی خۆم ته‌واو رژاند به‌سه‌رتاندا ورازی بووم كه ئیسلام دینی ئێوه بێت.

وه پیرۆزبایی لێ كردنیان به‌م بۆنانه‌وه حه‌رامه وجیاوازی نی‌یه ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵتاندا كار بكه‌ن یان نا.

وه ئه‌گه‌ر ئه‌وان پیرۆزبایی‌یان لێكردین به‌بۆنه‌ی چه‌ژنه‌كانیانه‌وه ئه‌وا ئێمه پیرۆزبایی‌یان لێ ناكه‌ین له‌سه‌ر ئه‌و شته، چونكه چه‌ژنی ئێمه نی‌یه، وه‌چه‌ژنانێكه كه خوای گه‌وره پێی رازی نی‌یه، چونكه یاخود داهێنراوه له دینه‌كه‌یاندا، یاخود له شه‌رعه‌كه‌یاندا هه‌بووه به‌ڵام سڕاوه‌ته‌وه به دینی ئیسلام كه خوای گه‌وره محمدی(صلى الله عليه وسلم) پێ ناردووه بۆ لای هه‌موو خه‌ڵكی بی تێكڕا، كه ده‌فه‌رمێت: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ [آل عمران: ٨٥].

واته: هه‌ركه‌سێك جگه له‌ئیسلام داوای دینێكی تر بكات و هه‌ڵی بژێرێت به‌سه‌ر ئیسلامدا ئه‌وا لای خوای گه‌وره لێی وه‌رناگیرێت، وه‌له دوا رۆژیشدا له زه‌ره‌ر مه‌ندان ده‌بێت.

وه حه‌رامه موسڵمان به‌ده‌میانه‌وه بچێت به‌م بۆنانه‌وه، چونكه ئه‌مه گه‌وره‌تره له پیرۆزبایی كردنیان، وه چونكه چون بۆ لایان به‌شداری كردنیانه له‌و ئاهه‌نگه‌دا، هه‌روه‌ها حه‌رامه موسڵمان خۆی بچوێنێت به‌كافران به‌وه‌ی كه ئاهه‌نگ بگێڕێت به‌م بۆنانه‌وه، یاخود دیاری بگۆڕێته‌وه، یاخود

شیرینی دابەش بكات، یاخود خواردن ببەخشێت، یاخود خۆی لەكار بخات وهاوشێوەی ئەمانە، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: ﴿مَنْ تَشَبَهَ بِقومٍ فَهُوَ مِنْهُم﴾[44].

واتە: هەركەسێك خۆی بچوێنێت بەهەر كۆمەڵێك ئەوا ئەویش لەوان دەژمێردرێت. وە شيخ الإسلام إبن تيمية ( رەحمەتی خوای لێ بێت) لە پەرتوكەكەیدا (إقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم) دەفەرمێت: ( خۆ چواندن پێیان لە هەندێك لە چەژنەكانیان دڵیان خۆش دەكات بەو بیروباوەڕە بەتاڵەی كەلە سەرین، وەلەوانەیە وایان لێ بكات كە هەلەكان بقۆزنەوە وباوەڕ لاوازەكان بەلای خۆیاندا رابكێشن.

وە هەركەسێك بەشداری شتێك لەوانە بكات ئەوا گوناھ بارە، ئیتر جیاوازی نی‌یە ئەگەر لە رودا دامان كردبێتی یاخود لە خۆشەویستیاندا، یاخود لەشەرمدا، یاخود جگە لەم هۆكارانە، چونكە ئەمە لە نزم كردنی دینی خوایە، وەلە هۆكارەكانی بە هێز كردنی دەروونی كافرانە وشانازی كردنیانە بە دینەكەیانەوە.

داواكارین لە خوای گەورە كە موسڵمانان بە عیزەت بكات بەدینەكەیان و دامەزراوی‌یان پێ ببەخشێت لەسەری وسەریان بخات بەسەر دوژمنەكەیاندا هەر ئەو بە هێز ودەسەڵاتە[45].

---

٤٤- (صحيح الجامع الصغير: ١/ ٢٨٣١).

٤٥- (فتاوى وأذكار لإتحاف الأخيار: ص٢٩-٣٢).

## حوكمی كرداره‌ خۆكوژی یه‌كان:

پ١٨ حوكمی كرداره‌ خۆكوژی‌یه‌كان چی‌یه‌؟

و له‌ڕاڤه‌ی فه‌رمووده‌ی چیرۆكی(أصحاب الأخدود)دا سوده‌ وه‌ده‌ست هاتوه‌كان دیاری ده‌كات و ده‌فه‌رمێت: دروسته‌ مرۆڤـ گیانی خۆی ببه‌خشێت له‌ پێناوی به‌رژه‌وه‌ندی گشتی موسڵمانان، ئه‌و منداڵه‌ ڕێنمایی پاشاكه‌ی كرد بۆ شتێك كه‌ به‌ هۆیه‌وه‌ بتوانێت بیكوژێت، كه‌ ئه‌ویش بریتی بوو له‌وه‌ی كه‌ تیرێك له‌ناو تیره‌كانی ده‌ربكات‌و بڵێت به‌ناوی په‌روه‌ردگاری ئه‌م منداڵه‌وه‌....

شيخ الإسلام ده‌فه‌رمێت: (چونكه‌ ئه‌مه‌ جیهاد كردنه‌ له‌ پێناوی خوای گه‌وره‌دا، ئوممه‌تێك باوه‌ڕیان هێناو ئه‌و منداڵه‌یش هیچ شتێكی له‌ ده‌ست نه‌چوو چونكه‌ مرد، وه‌ هه‌ر ده‌مرد له‌ داهاتوودا بوایا یاخود له‌ ڕابردوودا).

به‌ڵام ئه‌و كرداره‌ خۆكوژی‌یانه‌ی كه‌ هه‌ندێك له‌ خه‌ڵكی ده‌یكه‌ن به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ ته‌قینه‌وه‌ هه‌ڵده‌گرن‌و ده‌چنه‌ ناو كافرانه‌وه‌ پاشان له‌ ناویاندا خۆی ده‌ته‌قێنێته‌وه‌، ئه‌مه‌ خۆكوژی‌یه‌ په‌نا به‌ خوای گه‌وره‌، وه‌ هه‌ركه‌سێكیش خۆی بكوژێت ئه‌وا به‌ نه‌مری وهه‌میشه‌یی له‌ ئاگری دۆزه‌خدا ده‌مێنێته‌وه‌، هه‌روه‌كو چۆن له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم هاتووه‌، چونكه‌ ئه‌مه‌ خۆی كوشتووه‌ له‌ به‌رژه‌وه‌ندی ئیسلامدا نه‌بووه‌، چونكه‌ ئه‌گه‌ر خۆی بكوژێت و ده‌ كه‌س یاخود سه‌د كه‌س یاخود دووسه‌د كه‌س بكوژێت ئیسلام سود له‌مه‌ نابینێت‌و خه‌ڵكی نابنه‌ موسڵمان، به‌ پێچه‌وانه‌ی چیرۆكی منداڵه‌كه‌وه‌، وه‌ به‌م كاره‌ له‌وانه‌یه‌ دوژمن زیاتر سه‌خت‌و توندو تیژتر بێت و ئه‌م كاره‌ زیاتر دڵی قیناوی بكات، و كوشتاری موسڵمانان بكات به‌سه‌خترین شێوه‌ وله‌ناویان ببات. هه‌ره‌كو چۆن جوله‌كه‌ وا له‌ خه‌ڵكی فه‌له‌ستین ده‌كات ،خه‌ڵكی فه‌له‌ستین ئه‌گه‌ر یه‌كێكیان خۆی بته‌قێنێته‌وه‌و شه‌ش كه‌س یاخود حه‌وت كه‌س بكوژێت ئه‌وان له‌ تۆڵه‌ی ئه‌مه‌دا شه‌ست كه‌س یان زیاتر ده‌گرن، كه‌واته‌ نه‌ هیچ سود به‌ موسڵمانان گه‌یشت نه‌ به‌وانه‌ی كه‌وا ته‌قینه‌وه‌ له‌ ناویاندا كرا.

بۆیه وا دەبینین ئەوەی كه هەندێك له خەڵكی پێی هەڵدەستن لەم خۆتەقاندنەوەیه ئەوا خۆكوژییه بەبێ حەق، وه وا پێویست دەكات كه خاوەنەكەی بخاته ئاگری دۆزەخەوه –پەنا به خوای گەوره– وه خاوەنەكەی شەهید نییه، بەڵام ئەگەر مرۆڤـ ئەم كارەی كردو تەئویلی كردو گومانی وابوو كه دروسته، ئەوا ئێمه به ئومێدی ئەوەین كەوا تاوانبار نەبێت، بەڵام به شەهید بژمێردرێت ئەمەیان نا، چونكه ڕێگای شەهید بوونی نەگرتۆته بەر، وه هەر كەسێكیش كۆشش بكات وهەڵه بكات ئەوا خێرێكی بۆ هەیه[٤٦].

## حوكمی خۆ تەقاندنەوه لەناو كافراندا:

پ١٩ حوكمی شەرعی چییه كەوا كەسێك خۆی مین ڕێژ دەكات و خۆی دەتەقێنێتەوه لەناو كافراندا بۆ لەناو بردنیان؟ وه ئایا ڕاسته چیرۆكی منداڵەكه بكرێت به بەڵگه كه فەرمانی كرد به پاشاكه بیكوژێت؟

و ئەو كەسەی كه خۆی مین ڕێژ دەكات بۆ ئەوەی خۆی بتەقێنێتەوه لەناو كۆمەڵگایەك له كۆمەڵگاكانی دوژمندا، ئەوه خۆی كوشتووه، وه له ئاگری دۆزەخدا سزا دەدرێت بەو شتەی كه خۆی پێ كوشتووه، وه به نەمری تێیدا دەمێنێتەوه هەروەكو چۆن ئەم شته جێگیر بووه له پێغەمبەرەوه(صلى الله عليه وسلم)، وه سەیره ئەو كەسانەی كەبەم كاره هەڵدەستن و ئەم ئایەتەیش دەخوێننەوه كه خوای گەوره دەفەرمێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ [النساء: ٢٩]. واته: ئێوه خۆتان مەكوژن، چونكه به ڕاستی خوای گەوره زۆر بەبەزەییه له گەڵتاندا.

ئایا هیچ بەرهەم دێنن؟ ئایا دوژمن تێك دەشكێت؟ یاخود زیاتر توند و تیژترو سەخت تر دەبێت بەرامبەر ئەو كەسانەی كه بەم كاره هەڵدەستن، هەروەكو چۆن ئێستا بینراوه له وڵاتی جولەكەدا، كه بەم كارانه هیچ شتێكیان زیادی نەكردووه تەنها كەله ڕەقیو توند و تیژی نەبێت، بەڵكو دەبینین

---

٤٦- (فتاوى الأئمة في النوازل المدلهمة: ص١٢٧-١٢٨).

له‌وولاتی جوله‌كه‌دا له دوا ڕاپرسیدا (راست ره‌وه‌كان) تێیدا سه‌ركه‌وتن كه ده‌یانه‌وێت عه‌ره‌ب له‌ناو به‌رن. به‌ڵام هه‌ركه‌سێك ئه‌م كاره بكات و كۆشش بكات و واگومان به‌رێت كه به‌مه له خوای گه‌وره نزیك ده‌بێته‌وه، ئه‌وا دواكارین له خوای گه‌وره كه لێی نه‌گرێت چونكه ته‌ئویلی كردووه و نه‌زان بووه..

به‌ڵام چیرۆكی منداڵه‌كه بكرێت به‌به‌ڵگه، ئه‌وا چیرۆكی منداڵه‌كه به هۆیه‌وه خه‌ڵكی موسڵمان بوون و هاتنه ناو ئیسلامه‌وه، نه‌ك بۆ دوژمن كردنه په‌ندو تۆڵه سه‌ندنه‌وه، بۆیه كاتێك پاشاكه خه‌ڵكی كۆكرده‌وه تیرێكی له كێلانه‌ی منداڵه‌كه ده‌ركردو ووتی: به‌ناوی خوای په‌روه‌ردگاری ئه‌م منداڵه، خه‌ڵكی هه‌موو هاواریان كرد: په‌روه‌ردگار په‌روه‌ردگاری منداڵه‌كه‌یه، به هۆیه‌وه ئوممه‌تێكی گه‌وره موسڵمان بوون، ئه‌گه‌ر وه‌كو ئه‌م چیرۆكه ڕوویدات ئه‌وا ئێمه‌یش ده‌ڵێین بواری كردنه به‌ڵگه‌ی هه‌یه، وه پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆمانی گێڕایه‌وه تا په‌ندو ئامۆژگاری لیَ وه‌ربگرین، به‌ڵام ئه‌وانه‌ی كه‌وا خۆیان ده‌ته‌قێننه‌وه و ده‌كه‌س ده‌كوژن له دوژمن یاخود سه‌د كه‌س ده‌كوژن ئه‌وا دوژمن هیچ شتێكی زیاد ناكات ته‌نها ڕق و كینه‌و ده‌ست گرتن نه‌بێت به‌وه‌ی كه له‌سه‌رین[٤٧].

### حوكمی سه‌لام كردن له بیدعه چی:

پ٢٠ ئایا سه‌لام بكه‌ین له بیدعه‌چی؟

و ئه‌گه‌ر بیدعه‌كه‌ی كوفری بوو ئه‌وا دروست نی‌یه سه‌لامی لیَ بكه‌یت، چونكه سه‌لام كردن له كافر دروست نی‌یه، وه ئه‌گه‌ر بیدعه‌كه‌ی ناگه‌یشته كوفر وه‌كو ئه‌وه‌ی بیدعه‌چی بێت له هه‌ندێك له زیكره‌كاندا كه مرۆڤـ له ئیسلام ده‌رناكات هاوشێوه‌ی ئه‌مانه، ئه‌وا سه‌یری ئه‌وه ده‌كرێت ئه‌گه‌ر له‌سه‌لام نه‌كردن لێی به‌رژه‌وه‌ندی تێدا بوو ئه‌وا پێویسته سه‌لامی لیَ نه‌كه‌یت.

٤٧- (فتاوى الأئمة في النوازل المدلهمة: ص١٢٨-١٣٠).

چۆن بەرژەوەندی لە سەلام نەكردندا هەیە؟

بەڵێ. بۆ ئەوەی بزانێت كە وازی لێ هێنراوە تەنها لەبەر ئەوەیە كە بیدعەچیيە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوەو واز لە بیدعەكەی بهێنێت، لێرەدا پێویستە وازی لێ بهێنرێت و هەجر بكرێت بۆ ئەوەی تۆبە بكات، وە ئەگەر بەواز لێ هێنان و هەجر كردنەكە هیچ شتێكی زیادی ناكرد تەنها زیادڕەوی كردنی و بەرەو پیری چونی بیدعەكە وبانگەواز بۆ كردنی نەبێت ئەوا ئێمە وازی لێ ناهێنین و هەجری ناكەین، چونكە موسڵمانەوەو دروست نیيە موسڵمان هەجر بكرێت بەبێ بەرژەوەندیيەكی شەرعی[٤٨].

## حوكمی سەلام كردن لە كافر:

پ٢١ ئایا سەلام لە كافر بكەین؟

و نا نەخێر هەرگیز سەلامیان لێ ناكەین چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لا تَبْدَؤا اليَهُودَ والنَّصارى بِالسَّلام، وإذا لَقِيتُمُوهُم في طَرِيقٍ فاضْطَرُّوهُم إلى أضْيَقِهِ)[٤٩].

واتە: دەست پێشخەری مەكەن لە سەلام كردن لە جولەكەو گاورەكان، وە ئەگەر پێیان گەیشتن لە ڕێگادا ئەوا ناچاریان بكەن لە تەسك ترین لای ڕێگاكەدا بڕۆن .

لەگەڵ ئەوەی جولەكەو گاور لە هەموو كافرەكان باشترن، هەرچەندە هەموو كافرەكان بێخێرن و خێریان تێدا نیيە، بەڵام ئەمان چەند حوكمێكی تایبەتیان هەیە، بۆیە ئافرەت و سەربڕاوی دەستیان حەڵاڵە بۆمان، وە سەرانە(جزية)یان لێ دەسەنرێ ولەسەر دینی خۆیان دەمێننەوە، بەڵام جگە لەمان نە ئافرەتیان بۆمان حەڵاڵەو نەسەربڕاوی دەستیان، وە نە سەرانەیشیان لێ وەردەگیرێت بەرامبەر مانەوەیان لەسەر دینەكەیان لە لای زۆربەی زانایان.

---

٤٨- (اللقاء الشهري، رقم: ١٣، ص٢٠-٢١).

٤٩- (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٢/ ٧٠٤).

ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) به‌ره‌ڵستی ئه‌وه‌ی لیٚكردبین كه ده‌ست پێشخه‌ری سه‌لام كردن بكه‌ین له جوله‌كه‌و گاوره‌كان، ئه‌وا جگه له‌وان له بوذي وئاگر په‌رست و بت په‌رست وشیوعی- یه‌كان شایانترن به‌وه‌ی كه سه‌لامیان لیٚنه‌كه‌ین. بۆیه دروست نی‌یه سه‌لام له جوله‌كه‌و گاورو كافرانی تر بكه‌یت ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر چویته ناویانه‌وه له شوێنی دانیشتنه‌كانیان سه‌لامیان لیٚ مه‌كه وه‌كو گوێڕایه‌ڵی‌یه‌ك بۆ پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم)، وه هه‌ركه‌سێكیش گوێڕایه‌ڵی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) بكات ئه‌وا گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره‌ی كردووه: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ [النساء: ٨٠].

به‌ڵام ئه‌گه‌ر سه‌لامیان كرد ئایا وه‌ڵامیان بده‌مه‌وه؟

ده‌ڵێین: به‌ڵێ، وه‌ڵامی سه‌لام كردنیان ده‌ده‌ینه‌وه، چونكه خوای گه‌وره فه‌رمانی كردووه به دادپه‌روه‌ری و چاكه كردن، وه له دادپه‌روه‌ری نی‌یه ئه‌گه‌ر كه‌سێك سه‌لامت لیٚ بكات و وه‌ڵامی نه‌ده‌یته‌وه بۆیه له چاكه كاری‌یه‌كانی ئایینی ئیسلام ئه‌وه‌یه كه وه‌ڵامی سه‌لامی كافران بده‌ینه‌وه.

چۆن وه‌ڵامیان بده‌ینه‌وه؟

ئه‌گه‌ر به ئاشكراو به ڕاشكاوی ووتیان: السلام عليكم ئه‌وا پێیان ده‌ڵێین: عليكم السلام، به‌ڵام ئه‌گه‌ر به نهێنی ونادیاری ونائاشكرایی سه‌لامیان كرد ئه‌وا پێیان ده‌ڵێین: عليكم، یاخود وعليكم، پێیان ناڵێین: السلام چونكه جوله‌كه له‌مه‌دینه له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا بوون (صلی الله علیه وسلم) به ته‌نیشتیدا تێده‌په‌ڕین وپێیان ده‌وت: (السام عليك يامحمد) واته: مردنت له‌سه‌ر بێیتو بمریتو له‌ناوچیت ئه‌ی محمد (صلی الله علیه وسلم). وه سه‌لامه‌كه‌یان به ئاشكراو ڕوون ناوت، نایان ووت: السلام عليكم به‌ڵكو له نێوان ده‌ربڕینی(لام)ه‌كه‌و ده‌رنه‌بڕینی ده‌یان ووت، پێغه‌مبه‌ریش (صلی الله علیه وسلم) فه‌رمووی: «إِنَّ اليَهُودَ إذا سَلَّمُوا عَلَيكُمْ يَقُولُونَ السَّامُ عَلَيكُمْ، فَقُولُوا: وعَلَيكُمْ»[٥٠].

---

٥٠- (البخاري: ٦٢٥٧)، و(مسلم: ٢١٦٤).

واته: ئه‌گه‌ر جوله‌كه سه‌لامتان لێبكه‌ن ئه‌وا پێتان ده‌ڵێن: (السام عليكم) واته: مردنتان له‌سه‌ر بێت، ئێوه‌ش ته‌نها بڵێن: وعليكم، واته: له‌سه‌ر خۆتان. وه جوله‌كه‌یه‌ك به ته‌نیشت پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) تێپه‌ڕی و دایكی ئیمانداران خاتو عائیشه‌ی (خوای لێ ڕازی بێت) لابوو، جوله‌كه‌كه ووتی: (السام عليك يامحمد) عائیشه‌یش (خوای لێ ڕازی بێت) فه‌رمووی: (عليك السام واللعنة) واته: مردنو نه‌فره‌ت له سه‌ر خۆت بێت، واته: زیاتری پێووت له‌وه‌ی كه ووتی، به‌ڵام خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی:

﴿وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا﴾ [النساء: ٨٦]. واته: ئه‌گه‌ر سه‌لامتان لێكرا ئه‌وا وه‌ڵامی سه‌لامه‌كه بده‌نه‌وه به باشتر له‌و، یاخود وه‌كو خۆی وه‌ڵامی بده‌نه‌وه. جوله‌كه‌كه سه‌لامێكی خراپی كرد، عائیشه‌یش (خوای لێ ڕازی بێت) وه‌ڵامی دایه‌وه به خراپتر له‌و پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) به‌رهه‌ڵستی كردو پێی فه‌رمووو:

﴿إنَّ الله رفيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ في الأمرِ كُلِّهِ﴾. واته: خوای گه‌وره نه‌رم و نیانه‌و له هه‌موو ئیش وكارێكدا نه‌رم و نیانی خۆش ده‌وێت، عائیشه‌یش (خوای لێ ڕازی بێت) فه‌رمووی: ئایا نه‌تبیست چیان ووت؟ فه‌رمووی: (قد قلت: وعليكم)[٥١] .

واته: به‌ڵێ منیش پێم ووتن: له‌سه‌ر خۆتان.

له چاكه‌وه‌یه كه به‌باشتر وه‌ڵامی سه‌لام بده‌یته‌وه، وه له دادپه‌روه‌ری‌یه‌وه‌یه كه به‌خراپتر وه‌ڵامی سه‌لام نه‌ده‌یته‌وه، به‌م شێوه‌یه وه‌ڵامی پێویست ده‌ست ده‌كه‌وێت، ئه‌گه‌ر ووتیان: (السام عليك) ئه‌وا بڵێن: وعليكم بۆ خۆیان ده‌گه‌ڕێته‌وه، وه ئه‌گه‌ر ووتبێتیان: (السلام عليكم) ئه‌وا دیسان بۆ خۆیانه، وه ئه‌گه‌ر به ڕاشكاوی‌و ئاشكرایی بڵێن: (السلام عليكم) هه‌روه‌كو ئێستا لای زۆرێك له عه‌جه‌مه‌كان له هیندی و جگه له‌وانیش ده‌ڵێن: السلام عليكم وه كافریشه، تۆ چۆن وه‌ڵامی

---

٥١- (البخاري: ٦٢٥٦)، و(مسلم: ٢١٦٥).

ده‌ده‌یته‌وه‌؟ بۆت هه‌یه‌ بڵێیت: علیك السلام و هیچ شتێكی تێدا نی‌یه‌و ئاسایی‌یه‌، چونكه‌ ئیسلام ته‌رازووی حه‌ق و دادپه‌روه‌ری‌یه‌[٥٢]. :

## ده‌ست پێكردنی ته‌وقه‌ كردن

پ٢٢ زانای پایه‌ به‌رز ئه‌گه‌ر گه‌یشتم به‌ كۆمه‌ڵێك و ویستم سه‌لامیان لێ‌بكه‌م و ته‌وقه‌یان له‌ گه‌ڵدا بكه‌م، ئه‌گه‌ر پیاوێكی پیر یاخود خاوه‌ن پله‌و پایه‌یان له‌ ناودا بوو ئایا له‌وه‌وه‌ ده‌ست بكه‌م به‌سه‌لام كردن یاخود لای ڕاسته‌وه‌، پاشان ئه‌گه‌ر سه‌لامم لێكرد ئایا له‌ دوای ئه‌و له‌ ڕاستی ئه‌وه‌وه‌ به‌رده‌وام بم، یاخود لای ڕاستی خۆم؟

و ئه‌م بابه‌ته‌ لای هه‌ندێك له‌ خه‌ڵكی شاراوه‌یه‌، ئه‌گه‌ر به‌ یه‌كێك گه‌یشتی یاخود چویته‌ شوێنێك ئه‌وا له‌ گه‌وره‌وه‌ ده‌ست پێ‌ بكه‌ ئیتر ئایا به‌ ته‌وقه‌ كردن بێت، یاخود چای و قاوه‌ دانان بێت، یاخود هاوشێوه‌ی ئه‌مانه‌، هه‌ندێك له‌ خه‌ڵكی لای ڕاسته‌وه‌ ده‌ست پێ‌ ده‌كات ئه‌گه‌ر بچوكیش بێت، ئه‌مه‌ پێچه‌وانه‌ی سوننه‌ته‌، چونكه‌ پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم)، سیواكی به‌ده‌سته‌وه‌ بوو، وه‌ دوو پیاو له‌ پێشی‌یه‌وه‌ بوون وویستی بیداته‌ ده‌ست بچوكه‌كه‌یان پێی ووترا: له‌ گه‌وره‌وه‌ ده‌ست پێ‌ بكه‌ پاشان گه‌وره‌[٥٣].

ئه‌مه‌ به‌ پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر دانیشتبوو لای ڕاستی بچوك و لای چه‌پی گه‌وره‌ بوو ئه‌وا لای ڕاست پێش ده‌خات ئه‌گه‌ر بچوكیش بێت، به‌م شێوه‌یه‌ ئه‌گه‌ر چویته‌ شوێنێكه‌وه‌ له‌ گه‌وره‌وه‌ ده‌ست پێ‌ بكه‌ پاشان ده‌یدات به‌وه‌ی لای ڕاستی خۆیه‌وه‌ دانیشتوه‌ نه‌ك لای ڕاستی گه‌وره‌تر، بۆ نموونه‌

---

٥٢- (اللقاء الشهري، رقم: ١٣، ص٢٤-٢٧).

٢٣- (أبو داود: ٥٠)، وحسنه الشيخ الألباني في: (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٤/ ٧٦).

كه‌سێك چای دێنێت بۆ شوێنێك ده‌یدات به‌ گه‌وره‌ترین كه‌س، له‌دوای ئه‌و ده‌یدات به‌ كێ؟ لای ڕاستی خۆیه‌وه‌ ده‌ست پێ ده‌كات تا ته‌واو ده‌بێت پاشان ده‌یدات به‌ لای چه‌پی[٥٤].

**هێشتنه‌وه‌ی وێنه‌ له‌ ماڵه‌وه‌:**

پ٢٣ ئافره‌تێك پرسیار ده‌كات و ده‌ڵێت: جارێكیان ناچار بووم سه‌فه‌ر بكه‌م بۆ ده‌ره‌وه‌ی وڵات، وه‌ داوای وێنه‌م لێ كرا بۆ پاسه‌ پۆرته‌كه‌م، منیش كه‌سم ده‌ست نه‌كه‌وت ته‌نها شوێنی وێنه‌گرتنی پیاوان نه‌بێت، وێنه‌یه‌كم گرت له‌ پێویستیدا وه‌ یه‌كێك له‌ وێنه‌كانم لای خۆم هێشته‌وه‌، له‌وه‌ ده‌ترسام ئه‌گه‌ر له‌ناوی بده‌م جارێكی تر پێویستم پێی بێت و ناچاربم جارێكی تر خۆم نیشانی پیاو بده‌مه‌وه‌، ئێستا هێشتوومه‌ته‌وه‌ به‌ڵام له‌وه‌ ده‌ترسم كه‌ بێبه‌ش بم له‌ هاتنه‌ ژووره‌وه‌ی فریشته‌ بۆ ماڵه‌كه‌م. چی بكه‌م فه‌توامان بۆ بده‌ن خوا پاداشتی خێرتان بداته‌وه‌؟

و ده‌ڵێین مانه‌وه‌ی وێنه‌كه‌ باشتره‌ له‌ فه‌وتاندنی، ئه‌گه‌ر به‌ داپۆشراوی بیهێڵێته‌وه‌ له‌ناو جانتایه‌كدا، یاخود له‌ ناو دۆڵاب ئه‌وا نادیاره‌و شاراوه‌یه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له‌ ناوی ببات له‌وانه‌یه‌ له‌ داهاتوودا جارێكی تر پێویستی به‌وه‌ بێت كه‌ پیاو وێنه‌ی بگرێت، وه‌ پاره‌ی زیاتریشی له‌ده‌ست بچێت، بۆیه‌ مانه‌وه‌ی باشتره‌، هه‌روه‌ها سه‌باره‌ت به‌ پیاوانیش له‌وانه‌یه‌ چه‌ند وێنه‌یه‌ك بگرن‌و له‌ داهاتوودا پێویستیان بێت ده‌ڵێین: ئاساییه‌ هه‌ڵی بگرن بۆ داهاتوو[٥٥].

---

٥٤- (اللقاء الشهري، رقم: ١٣، ص٣٢-٣٣).

٥٥- (اللقاء الشهري، رقم: ١٣، ص٤٧-٤٨).

**گێڕانه‌وه‌ی نوكته‌و قسه‌ی هه‌ڵبه‌ستراو:**

**پ٢٤ بۆچونی به‌ڕێزتان چی‌یه سه‌باره‌ت به‌و نوكته‌و چیرۆكانه‌ی كه له دانیشتنه تایبه‌ت و گشتی-یه‌كاندا باس ده‌كرێن بۆ خۆشی؟ له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه ئه‌م شتانه زۆرجار ڕاست نی‌یه‌و هه‌ڵبه‌ستراوه به‌ڵگه‌یشیان له‌و شته‌دا ئه‌وه‌یه كه بیسه‌ر ده‌زانێت ڕاست نی‌یه؟**

**و به‌ڵێ. چیرۆكه خه‌یاڵی و ناڕاستی‌یه‌كان كه دروست كراوی خه‌یاڵه‌و هیچ بنچینه‌یه‌كی نی‌یه ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ر** (صلى الله عليه وسلم) **ده‌یگرێته‌وه كه ده‌فه‌رمێت:**

﴿وَيْلٌ لِمَنْ حَدَّثَ فَكَذَبَ لِيضَحكَ بِهِ القومُ وَيلٌ له ثُمَّ ويل له﴾[٥٦].

**واته: هاوارو سزا بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی كه قسه بكات و درۆ بكات بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی پێبكه‌نن هاوارو سزا بۆ ئه‌و، هاوارو سزا بۆ ئه‌و.**

**سێ جار پێغه‌مبه‌ر** (صلى الله عليه وسلم) **دوباره‌ی كردووه ئه‌مه‌یش به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه حه‌رامه، بۆیه هه‌ركه‌سێك چیرۆكی خه‌یاڵی ناڕاستی باس بكات بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی پێبكه‌نێت ئه‌وا تاوانباره‌و هه‌ڕه‌شه لێكراوه به‌م هه‌ڕه‌شه‌یه -په‌نا به خوای گه‌وره-:** (ويل لمن حدث فكذب ليضحك به القوم ويل له ثم ويل له)[٥٧].

---

٥٦- ( صحيح الجامع الصغير: ٧١٣٦).

٥٧- (اللقاء الشهري، رقم: ١٣، ص٤٨-٤٩).

**ده‌ركردنی غوسڵ به‌ بێ ده‌ست نوێژ هه‌ڵگرتن:**

پ٢٥ غوسڵی جه‌نابه‌تم ده‌ركردووه‌و ده‌ست نوێژم هه‌ڵنه‌گرتووه‌، ئایا جێگای ده‌ست نوێژیش ده‌گرێته‌وه‌و ڕاسته‌وخۆ نوێژ بكه‌م؟

و به‌ڵێ دروسته‌ بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی‌كه‌ جه‌نابه‌تی له‌سه‌ره‌(له‌ش گرانی) ته‌نها غوسڵ ده‌ربكات له‌گه‌ڵ ئاو له‌ده‌مو گوێ وه‌ردان، چونكه‌ خوای گه‌وره‌ له‌ قورئانی پیرۆزدا ده‌فه‌رمێت: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾ [المائدة: ٦].

واته‌: ئه‌گه‌ر ئێوه‌ له‌شتان گران بوو ئه‌وا غوسڵ ده‌ركه‌ن وخۆتان بشۆرن، لێره‌دا خوای گه‌وره‌ باسی ده‌ست نوێژ گرتن ناكات.

وه‌له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی درێژدا هاتووه‌ كه‌ پیاوێك جیاببووه‌وه‌ و نوێژی به‌كۆمه‌ڵی نه‌ده‌كرد، پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) پێی فه‌رمووی: ﴿مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ﴾.واته‌: چی قه‌ده‌غه‌ت ده‌كات له‌ نوێژ كردن و بۆچی نوێژیان له‌ گه‌ڵدا ناكه‌یت؟ پیاوه‌كه‌یش ووتی: تووشی له‌ش گرانی بوومه‌و ئاویش نی‌یه‌، پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) پێی فه‌رموو: ﴿عليكَ بِالصَّعِيدِ فإنَّهُ يَكْفِيكَ﴾(٥٨).واته‌: ته‌یه‌مم بكه‌ ئه‌وه‌ت به‌سه‌. پاشان ئاو په‌یدا بوو پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) زیاده‌كه‌ی پێداو فه‌رمووی: ﴿خُذْ هذا أفْرِغْهُ على نَفْسِكَ﴾(٥٩). واته‌: ئه‌م ئاوه‌ بگره‌و بیكه‌ به‌ خۆتداو غوسڵی پێ ده‌ربكه‌.

لێره‌یشدا پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) باسی ده‌ست نوێژ هه‌ڵگرتن ناكات، بۆیه‌ قورئان‌و سوننه‌ت ده‌لاله‌تیان كرد له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ هه‌ركه‌سێك جه‌نابه‌تی له‌سه‌ر بێت ئه‌گه‌ر غوسڵی ده‌ركرد ئه‌وا به‌سیه‌تی و جێگای ده‌ست نوێژ هه‌ڵگرتنیش ده‌گرێته‌وه‌و پێویست به‌ ده‌ست نوێژ هه‌ڵگرتن ناكات،

---

٥٨- (البخاري عن عمران بن حصين(رضي الله عنه): ٣٤٤).

٥٩- (البخاري: ٥٨٩٢)، و(مسلم: ٢٥٩[٥٤]).

به‌ڵام باشتر وایه غوسڵی ته‌واو ده‌ربكرێت كه ئه‌ویش بریتی‌یه له‌وه‌ی كه یه‌كه‌مجار ده‌ست نوێژێكی ته‌واو هه‌ڵبگرێت و پاشان سێ جار ئاو بكات به‌سه‌ریدا تا ته‌ڕ بێت و پاشان هه‌موو له‌شی بشوات[٦٠].

**سه‌ره‌نجامی ئافره‌تی باوه‌ڕدار له‌به‌هه‌شتدا ئه‌گه‌ر پێش شوكردنی بمرێت:**

پ٢٦ ئه‌گه‌ر ئافره‌تی باوه‌ڕدار شوبكات و بمرێت ئه‌وا له‌به‌هه‌شتدا له‌گه‌ڵ مێرده‌كه‌ی ده‌بێت، وه ئه‌گه‌ر دوو مێردی هه‌بوو بێت ئه‌وا یه‌كێكیان هه‌ڵده‌بژێرێت له‌به‌هه‌شتدا به ویستی خۆی، باشه ئه‌ی سه‌ره‌نجامی ئافره‌تی باوه‌ڕدار چی‌یه له‌به‌هه‌شتدا ئه‌گه‌ر پێش شوكردنی بمرێت؟

و ئه‌گه‌ر شووی نه‌كردبێت ئه‌وا خوای گه‌وره له‌به‌هه‌شتدا مێردی بۆ داده‌نێت: ﴿ إِنَّا أَنْشَأْنَاهُنَّ إِنْشَاءً فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا عُرُبًا أَتْرَابًا﴾ [الواقعة: ٣٥-٣٧].

به‌ڵام له‌وانه‌یه پێم بڵێن: ئایا ئێمه له دوعای نوێژی مردودا ناڵێین: (أَبْدِلْهَا زوجاً خيراً مِنْ زوجِها).

واته: خوایه مێرده‌كه‌ی له‌به‌هه‌شتدا بۆ بگۆڕه به مێردێكی باشتر له‌وه‌ی خۆی؟ به‌ڵام ئه‌مه ئاڵۆزه، چونكه ئه‌گه‌ر شوی كردبێت چۆن ده‌ڵێین: خوایه مێرده‌كه‌ی له‌به‌هه‌شتدا بۆ بگۆڕه به مێردێكی باشتر له‌وه‌ی خۆی؟ وه ئه‌گه‌ر شووی نه‌كردوه كوا مێرده‌كه‌ی؟

و ده‌ڵێین: شووی نه‌كردووه مه‌به‌ست له‌پاڕانه‌وه‌كه ئه‌وه‌یه كه مێرده‌كه‌ی بۆ بگۆڕه به باشتر له‌و مێرده‌ی كه بۆی دیاری كرابوو ئه‌گه‌ر بمایاو نه‌مردایا، وه ئه‌گه‌ر مێردی هه‌بێت ئه‌وا مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه كه سیفاتی مێرده‌كه‌ی بۆ بگۆڕه به باشتر له سیفاته‌كانی دونیای، چونكه گۆڕان جاری وا هه‌یه به گۆڕانی خودی شته‌كه ده‌بێت وه‌كو چۆن مه‌ڕێك بگۆڕیت به وشترێك، وه جاری وا هه‌یه به گۆڕینی وه‌سفه‌كان ده‌بێت وه‌كو ده‌ڵێیت: خوای گه‌وره كوفری ئه‌م پیاوه‌ی گۆڕی بۆ باوه‌ڕ، هه‌روه‌ها وه‌كو خوای گه‌وره ده‌فه‌رمێت:

---

٦٠- (اللقاء الشهري، رقم: ١٣، ص٥٠-٥١).

﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ﴾ [إبراهيم: ٤٨]. واته: ڕۆژی قیامه‌ت زه‌وی و ئاسمانه‌كان ده‌گۆڕێت بۆ جگه له‌م زه‌وی‌و ئاسمانانه، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی زه‌وی هه‌مان زه‌وی‌یه به‌ڵام درێژ كراوه‌ته‌وه، وه ئاسمان هه‌مان ئاسمانه به‌ڵام له‌ت بووه[٦١].

## شیردانی ئافره‌ت به مندالی جگه له خۆی به پیاڵه:

پ٢٧ ئایا ئافره‌ت شیر بدات به مندالی جگه له خۆی به پیاڵه ده‌بێت به مندالی خۆی و منداڵه‌كانی لێی حه‌رام بن؟

و شیر پێدان ئه‌گه‌ر به پیاڵه بێت یان به مه‌مك جیاوازی نی‌یه‌و یه‌كسانه‌و حه‌رامی ده‌كات ئه‌گه‌ر بگاته پێنج جار، چونكه خۆراكی منداڵه‌كه‌یه ئیتر ئایا به پیاڵه بێت یان به مه‌مك چونكه پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) ده‌فه‌رمێت:

﴿إنَّما الرَّضَاعَةُ مِنَ المجَاعَةِ﴾[٦٢].

واته: ته‌نها شیر پێدانی منداڵ له برسێتی‌یه‌وه‌یه.

كه‌واته: ئه‌و شیر پێدانه‌ی كه برسێتی تیر بكات ئه‌وا حه‌رامی ده‌كات، ئیتر یه‌كسانه وجیاوازی نی‌یه ڕاسته‌وخۆ شیره‌كه له مه‌مكی ئافره‌ته‌كه‌وه بخوات، یاخود به‌هۆی پیاڵه‌و قاپێكه‌وه بێت[٦٣].

## ئامۆژگاری كردنی خه‌ڵكی به‌شێوازێكی به‌رده‌وام له‌سه‌ر گۆڕ:

پ٢٨ حوكمی ئامۆژگاری كردنی خه‌ڵكی چی‌یه به‌شێوازێكی به‌رده‌وام له‌سه‌ر گۆڕ؟

و وا ده‌بینم كه پێچه‌وانه‌ی سوننه‌ته، چونكه له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا(صلى الله عليه وسلم) شتی وا نه‌بووه، كه له هه‌موو كه‌س زیاتر ئامۆژگاری خه‌ڵكی كردووه، وه له هه‌موویان زیاتر سوور بوه

---

٦١- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٣، ص٢٣-٢٤).

٦٢- (البخاري: ٢٦٤٧)، و(مسلم: ١٤٥٥).

٦٣- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٣، ص٢٤).

له‌سه‌ر گه‌یاندنی حه‌ق، وه‌ نه‌مانزانیوه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) هه‌رگیز له‌سه‌ر گۆڕ ئامۆژگاری كردبێت وبه‌ پێوه‌ قسه‌ی كردبێت، هه‌روه‌كو چۆن خه‌طیب وتار ده‌دات، به‌ڵكو ته‌نها چه‌ند ووشه‌یه‌كی لێوه‌ ده‌رچووه‌ وه‌كو ئه‌وه‌ی كه‌ گه‌یشتنه‌ سه‌ر گۆڕێك هێشتا بانی نه‌درابوو دانیشت و خه‌ڵكیش له‌ده‌وری دانیشتن، ئه‌ویش قسه‌ی بۆ كردن كه‌ له‌كاتی مردندا چی ڕووده‌دات، ئه‌مه‌ **یه‌كه‌م**، وه‌ ئه‌مه‌یش ووتار نه‌بووه‌، ڕانه‌وه‌ستاوه‌ له‌ نێوان خه‌ڵكیداو ووتاریان بۆ بدات و ئامۆژگاریان بكات و قسه‌یان له‌گه‌ڵ بكات. **دووه‌میش:** كاتێك له‌سه‌ر لێواری گۆڕێك دانیشتبوو فه‌رمووی:

﴿ما مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ إلا وقد كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الجنةِ أو النارِ﴾. واته‌: هیچ كه‌سێك نی‌یه‌ له‌ ئێوه‌ ئیلا شوێنی دیاری كراوه‌ له‌ به‌هه‌شت یاخود دۆزه‌خ، هاوه‌ڵانیش(خوایان لێ رازی بێت) ووتیان: ئایا ئیتر بۆ واز له‌ كرده‌وه‌ نه‌هێنین و پاڵ نه‌ده‌ینه‌وه‌؟! فه‌رمووی: ﴿ لا إعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لما خُلِقَ﴾[٦٤].

واته‌: نه‌خێر واز له‌ كرده‌وه‌ مه‌هێنن و به‌رده‌وام بن له‌سه‌ر كرده‌وه‌ی چاك، چونكه‌ هه‌موو كه‌سێك بۆ كوێ دروست كرابێت ئه‌وا كرده‌وه‌ی ئه‌و شوێنه‌ی بۆ ئاسان كراوه‌.

به‌ڵام ئه‌مه‌ بكات به‌ داب و نه‌ریت وهه‌ركاتێك مردوویه‌ك به‌خاك سپێردرا یه‌كێك له‌ناو خه‌ڵكی هه‌ڵسێت و ووتار بۆ خه‌ڵكی بدات و قسه‌یان بۆ بكات ئه‌مه‌ له‌ داب و نه‌ریتی پێشینه‌ چاكه‌كان نه‌بووه‌ به‌ ڕه‌هایی، وه‌ با له‌م شته‌دا بگه‌ڕێته‌وه‌ بۆ سوننه‌ت، وه‌ له‌وه‌ ده‌ترسم ئه‌مه‌ له‌ توندڕه‌وی بێت چونكه‌ شوێنه‌كه‌ له‌ ڕاستیدا شوێنی خشوع و هێمنی وئارامی‌یه‌ نه‌ك شوێنی جوڵاندنی سۆز.

وه‌ شوێنی ووتاردان سه‌ر مینبه‌رو مزگه‌وته‌كانه‌ هه‌روه‌كو چۆن پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) ئه‌مه‌ی ده‌كرد، وه‌ نابێت شتی تایبه‌ت بكه‌ین به‌ به‌ڵگه‌ له‌سه‌ر شتی گشتی، واته‌: ئه‌گه‌ر كه‌سێك بڵێت: فه‌رمووده‌كه‌ی ئیمامی عه‌لی(خوای لێ رازی بێت) كه‌له‌سه‌ر لێواری گۆڕه‌كه‌ ڕاوه‌ستابوو هه‌روه‌ها فه‌رمووده‌كه‌ی تر كه‌ دانیشتبوو چاوه‌ڕێی ئه‌وه‌ بوو گۆڕه‌كه‌ گۆڕیچكه‌ی بۆ بكرێت و

---

٦٤- (البخاري: ٤٩٤٩)، و(مسلم: ٢٦٤٧).

قسەیان بۆ بكات دەكەینە بنچینە لەم بابەتەدا. ئەوا پێیان دەڵێین: ئەم بنچینەیە ڕاست نییە، چونكە ئەگەر بنچینە بوایە لەم بابەتەدا ئەوا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەكاری دەهێنا لە ژیانیدا وە كاتێك كە وازی لێ هێنا ئەوا واز لێ هێنانی سوننەتە[٦٥].

**سڕینەوەی چاكەكان:**

پ٢٩ چاكەكان خراپەكان دەسڕنەوە، ئایا خراپەكانیش چاكەكان دەسڕنەوە؟

و چاكەكان خراپەكان دەسڕنەوە ونایهێڵن هەروەكو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿الصَلَواتُ الخَمْسُ، والجُمُعَةُ الى الجُمُعَةِ، ورَمَضانٌ الى رمضان مُكَفِّرَاتٌ لما بينهُنَّ ما اجْتُنِبَتِ الكبائِرُ﴾[٦٦].

واتە: نوێژە فەرزەكان، و هەینی بۆ هەینی، و ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان تاوانەكان لە نێوانیاندا دەسڕنەوە ئەگەر مرۆڤـ خۆی بپارێزێت لە تاوانە گەورەكان.

بەڵام خراپەكان چاكەكان بسڕنەوە نەخێر چاكەكان ناسڕنەوە بەڵام لەكاتی كێشاندا لە ڕۆژی قیامەتدا لەوانەیە زاڵ بێت بەسەر چاكەكاندا و قورستر بێت، خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ [الأنبياء: ٤٧].

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازووی دادپەروەری دادەنێین، كردەوە چاكەكانو خراپەكان دەكێشین، لەوانەیە خراپەكان زیاد بكات و مرۆڤـ شایانی چونە دۆزەخەوە بێت و بەهۆیەوە سزا بدرێت بە گوێرەی تاوانەكەی، وە لەوانەیە چاكەكان و خراپەكان یەكسان بن ومرۆڤـ لە ئەهلی ئەعراف بێت (ئەوانەی كە چاكەو خراپەكانیان یەكسانەو لە نێوان بەهەشت ودۆزەخدا دەمێننەوە و ناچنە

---

٦٥-(لقاء الباب المفتوح، رقم: ٣، ص٢٤-٢٦).

٦٦- (مسلم: ٢٣٣).

بەهەشتەوە ئیلا پاش ویست و ڕێگە پێدانی خوای گەورە نەبێت)، وە لەوانەیە چاكەكان زیاتر بێت و بچێتە بەهەشتەوە[٦٧].

**حەج كردنی ئافرەت بە بێ مەحرەم:**

پ٣٠ ئایا ئافرەت ئەگەر حەج بكات بە بێ مەحرەم پێویستە جارێكی تر حەج بكاتەوە یان نا؟

و ئەگەر ئافرەت بە بێ مەحرەم حەج بكات ئەوا سەرپێچی خوای گەورەو پێغەمبەری كردووە(صلى الله عليه وسلم)، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿لا تُسافِرُ إمْرأةٌ إلا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ﴾.

واتە: ئافرەت نابێت سەفەر بكات بە بێ مەحرەم، پیاوێك هەستاو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) من خێزانم دەرچووە بۆ حەج كردن، وە منیش ماومەتەوە بۆ غەزای ئەوەو ئەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:

﴿إنْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ إمْرَأتِكَ﴾[٦٨]. واتە: برۆ لەگەڵ خێزانەكەتدا حەج بكە.

بەڵام بە بێ مەحرەم حەجەكەی تەواوەو لەسەری لاچووە، واتە: پێویست نیيە لەسەری جارێكی تر دووبارەی بكاتەوە، بەڵكو پێویستە لەسەری بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورەو داوای لێخۆشبوونی لێ بكات لەوەی كە ڕووی داوە(بەبێ مەحرەم چووە بۆ حەج)[٦٩].

---

٦٧- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٣، ص٣٦-٣٧).

٦٨- (البخاري: ٣٠٠٦)، و(مسلم: ١٣٤١).

٦٩- (لقاء الباب المفتوح، رقم: ٣، ص٢٩).

**حەج كردن لە جیاتی نەخۆش:**

**پ٣١ گەنجێك تەمەنی بیست ساڵەو زەندی برینەو خوێنی لێ دێت، هەروەها شەلیشەو هێشتا حەجی نەكردووە ودەیەوێت ئەمساڵ حەج بكات، بەڵام لە قەرەباڵەغی حەج دەترسێت توشی خوێن بەربوون بێت چی بكات؟**

**و ئەگەر ئەم گەنجە توانای هەیە بەپارە بەڵام توانای نیە بەلاشە ئەوا دەتوانێت كەسێكی تر لە جیاتی خۆی بنێرێت و حەجی بۆ بكات، لەبەر فەرموودەكەی ابن عباس (خوایان لێ ڕازی بێت) كە دەفەرمێت:**

إنَّ إمرأةً من خثعم قالت: يارسول الله إنَّ أبي أدرَكَتْهُ فريضةُ اللهِ على عباده الحَج شيخاً لا يَثْبُتُ على الراحلة، أفأحج عنه؟ ﴿قال: نعم﴾[٧٠].

**واتە: ئافرەتێك لە** خثعم **ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(**صلى الله عليه وسلم**) باوكم پیرەو حەجی لەسەر فەرزەو ناتوانێت لەسەر وشتر خۆی بگرێت وتوانای نیە، ئایا من لە جیاتی ئەو حەجی بۆ بكەم؟ فەرمووی: بەڵێ. ئەگەر ئەم پیاوە ناتوانێت حەج بكات چونكە شەلە یاخود كە بریندار بێت بەهەر برینێك خوێنەكەی ناوەستێتەوەو نەزیف دەبێت كە ئەمەیش مەترسیە لەسەر ژیانی، ئەوا عوزری هەیە لەبەر برینەكەی و نارەحەتی قەڵەباڵەغی، وە ئەگەر حەجیش بكات تاوانی لەسەر نی-یە**[٧١].

---

٧٠- (متفق عليه، وانظر: إرواء الغليل: ٩٩٢).

٧١-(لقاء الباب المفتوح، رقم: ٣، ص٢٨-٢٩).

**سیواك كردن له‌كاتی به‌ڕۆژوو بووندا :**

پ٣٢ سیواك كردن له كاتی به‌ڕۆژوو بوون به سیواكێكی ته‌ڕ هه‌ست به‌هه‌ندێك تام ده‌كرێت له‌و سیواكه‌داو قورسه له‌سه‌ری ئه‌و تفه فڕێ بدات یان له‌به‌ر زۆری یان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ناو مزگه‌وتدایه حوكمی قوت دانی ئه‌و تفه چی‌یه ؟

و دروست نی‌یه ئه‌و تفه قوت بدات كه سیواكه‌كه تامی تێكراوه، به‌ڵكو پێویسته له‌سه‌ری سیواكه‌كه‌ی بشوات وپاكی بكاته‌وه له‌و تامه پاشان به‌كاری بهێنێت، یاخود سه‌ره‌تای به‌كارهێنانه‌كه‌ی به‌شه‌و بێت تا تامه‌كه‌ی نامێنێت پاشان كه تامی نه‌ما به ڕۆژ به‌كاری بهێنێت، وه ئه‌گه‌ر نه‌یتوانی ئه‌وا ده‌بێت ئه‌و تفه‌ی كه تامی سیواكه‌كه‌ی تێدایه فڕێی بدات، وه ئه‌گه‌ر له مزگه‌وت بوو ئه‌وا ئێستا ده‌سته‌سڕ زۆره ده‌توانێت تفه‌كه‌ی تێ بكات، وه ئه‌گه‌ر نه‌یتوانی، یاخود زۆربوو ئه‌وا با به‌ڕۆژ سیواك نه‌كات چونكه سیواك كردن واجب نی‌یه[٧٢]

**كردنی هه‌ندێك له ڕۆژو به‌تاڵ كه‌ره‌وه‌كان به نه‌زانی :**

پ٣٣ هه‌ندێك له ڕۆژوو به‌تاڵ كه‌ره‌وه‌كانم كردووه ونه‌مزانیوه كه ڕۆژوو به‌تاڵ ده‌كه‌نه‌وه، وه چه‌ند ڕۆژێكی زۆر كردوومه‌و ئێستا ژماره‌ی ڕۆژه‌كان نازانم ئایا چیم له‌سه‌ره‌و چی بكه‌م؟

و هیچ شتێكت له‌سه‌ر نی‌یه: نه‌گێڕانه‌وه‌ی ڕۆژوو، نه تاوان چونكه نه‌تزانیوه كه ئه‌و شتانه ڕۆژوو به‌تاڵ ده‌كه‌نه‌وه[٧٣].

---

٧٢- (اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٥٧-٥٨).

٧٣- (اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٥٨).

**قه‌زا نه‌كردنه‌وه‌ی ڕۆژوو بۆ ماوه‌ی سی ساڵ:**

پ٣٤ ئافره‌تێك له ڕه‌مه‌زاندا كه تووشی(حه‌یز) بوه ڕۆژووی شكاندووه به‌ڵام له‌پاش ڕه‌مه‌زان قه‌زای نه‌كردۆته‌وه، وه سی ساڵه به‌م شێوه‌یه‌یه چی له‌سه‌ره؟

و ئه‌گه‌ر ئه‌و ئافره‌ته له شوێنێكی دوور له زانایان و فێرخوازانی زانستی شه‌رعی بێت وه‌كو ئه‌وه‌ی له ده‌شتێكی دوور ژیابێت و حوكمی ئه‌و شته‌ی نه‌زانیبێت، ئه‌وا قه‌زا كردنه‌وه‌ی له‌سه‌ر نی‌یه، چونكه عوزری هه‌یه به‌ڵام ئه‌گه‌ر كه‌مته‌رخه‌م بووبێت به‌وه‌ی كه له شارێكدا ژیابێت كه زانای تێدا بووه، ئه‌وا ئه‌و حوكمه نادیار نابێت ئیلا له لای كه‌سێكی كه‌مته‌رخه‌م وبیٚ بایه‌خ وپشت گویٚ خه‌ر نه‌بێت، ئه‌گه‌ر وابوو ئه‌وا پێویسته قه‌زای ئه‌و ڕۆژانه بكاته‌وه كه تێیدا به ڕۆژوو نه‌بووه، وه ئه‌گه‌ر گومانی هه‌بوو ئه‌وا كار به دڵنیای ده‌كات كه كه‌مه‌كه‌یه، بۆ نمونه ئه‌گه‌ر گومانی هه‌یه كه سیٚ ساڵه یاخود دوو ئه‌و دوو ساڵه‌كه ده‌ژمێردرێت، وه ئه‌گه‌ر گومانی هه‌بوو چوار ساڵه یاخود سیٚ ساڵه ئه‌وا سیٚ ساڵه‌كه ده‌ژمێردرێت و به‌م شێوه‌یه[٧٤].

**به ڕۆژوو نه‌بوون به هۆی سه‌فه‌ر كردن به فڕۆكه:**

پ٣٥ زانای پایه‌به‌رز باسی ئه‌وه‌تان كرد كه دروسته مرۆڤـ به‌ڕۆژوو نه‌بێت له‌ڕه‌مه‌زاندا به‌هۆی سه‌فه‌ركردنی هه‌رچه‌نده به فڕۆكه بێت یاخود ئۆتۆمبێلێك كه فێنك كه‌ره‌وه‌ی تێدا بێت، ئه‌گه‌ر كه‌سێك بڵێت به‌ڵگه‌ت چی‌یه له‌سه‌ر ئه‌م شته له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه ئه‌م شتانه له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) نه‌بووه ئایا بنچینه‌ی قیاس له هاوشێوه‌ی ئه‌م شتانه چی‌یه؟

و لێره‌دا هیچ قیاس نی‌یه، چونكه ئه‌وانه‌ی كه سه‌فه‌ر ده‌كه‌ن به ئۆتۆمبێل بێت یان فڕۆكه ڕێبوارن و وولاٌتی خۆیان به‌جیٚ هێشتووه كه ئه‌مه‌یش سه‌فه‌ره، به‌ڵام سه‌باره‌ت به ئۆتۆمبێل و فڕۆكه ئه‌وا

---

٧٤-(اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٥٨-٥٩).

خوای گه‌وره له قورئانی پیرۆزدا باسی كردووه كه ده‌فه‌رمێت: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ﴾ [الزخرف: ١٢].

واته: خوای گه‌وره كه‌شتی وئاژه‌ڵی بۆ ژێربار وئاسان كردون بۆ سوار بوونیان.

وه ئه‌گه‌ر له‌سه‌رده‌می هاتنه خواره‌وه‌ی قورئاندا هه‌ر كه‌شتی ئاو زانرابێت ئه‌وا له پاش سه‌رده‌می هاتنه خواره‌وه‌ی قورئان كه‌شتی وشكانی زانرا، وه كه‌شتی ئاسمانی زانرا، وه(ال) له(الفلك) یاخود بۆ جنسه یاخود بۆ گشتێتی‌یه، وه خوای گه‌وره ده‌فه‌رمێت:

﴿ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ [النحل: ٨]. واته: خوای گه‌وره ماین و ئه‌سپ و گوێدرێژی بۆ دروست كردوون بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ندێكیان بۆ سواری وهه‌ندێكیان بۆ جوانی به‌كار بهێنن، وه خوای گه‌وره شتی وا دروست ده‌كات ئێوه نایزانن.

كه‌واته ئۆتۆمبێل و گوێدرێژو كه‌شتی و وشتر هه‌موو هۆكاری سه‌فه‌ر كردنن، وه عیبره‌ت به مه‌به‌سته‌كه‌یه كه سه‌فه‌ر كردنه‌كه‌یه، وه له‌م بابه‌ته‌دا قیاس نی‌یه چونكه ده‌ق ده‌یگرێته‌وه به بێ قیاس[٧٥].

## ماوه‌ی خه‌تم كردنی قورئان:

پ٣٦ ئه‌و ماوه‌یه‌مان بۆ دیاری بكه‌ن كه قورئانی تێدا خه‌تم بكرێت، وه ئه‌وه‌ی كه پێغه‌مبه‌رو هاوه‌ڵه به‌رێزه‌كانی كردوویانه؟

و كه‌مترین ماوه كه قورئانی تێدا خه‌تم بكرێت سێ ڕۆژه، هه‌رچه‌نده هه‌یه له شوێن كه‌وتوان (التابعين) كه قورئانیان خه‌تم كردووه له شه‌و و ڕۆژێكدا به تایبه‌تی له ڕه‌مه‌زاندا، به‌ڵام چاكتر وایه كه خه‌تم بكرێت له سێ ڕۆژدا، وه ئه‌گه‌ر له پێنج ڕۆژ یاخود شه‌ش ڕۆژیشدا خه‌تمی كرد ئه‌وا هه‌ر

---

٧٥- (اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٦٢-٦٣).

ئاساییه‌، وه‌ ئه‌گه‌ر له‌ مانگێكدا جارێك یاخود دووجار خه‌تمی كرد ئه‌وا ئاساییه‌و شته‌كه‌ فراوانه‌، گرنگ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ڕه‌مه‌زان تایبه‌تمه‌ندێتی هه‌بێت له‌ قورئان خوێندندا[٧٦].

## ئاشكرا كردنی به‌ڕۆژوو نه‌بوون له‌سه‌فه‌ردا :

پ٣٧ ئایا ده‌توانم به‌ڕۆژوو نه‌بوونم له‌سه‌فه‌ردا ئاشكرا بكه‌م تا بۆ خه‌ڵكی ڕوونی بكه‌مه‌وه‌ كه‌ ڕێگه‌ی پێدراوه‌ ؟

و بەڵێ، تۆ پاداشتت هه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌م كاره‌ت، ئه‌گه‌ر به‌ڕۆژوو نه‌بوونت ئاشكرا كرد بۆ خه‌ڵكی له‌سه‌فه‌ردا[٧٧].

## به‌كارهێنانی حه‌بی ڕاگرتنی خوێنی بێ نوێژی( حيض ) بۆ پێویستی :

پ٣٨ ئه‌گه‌ر ئافره‌ت خوێنی بێ نوێژی بكه‌وێته‌ ده‌ ڕۆژی كۆتایی ڕه‌مه‌زان، ئایا ده‌توانێت حه‌بی ڕاگرتنی خوێنی بێ نوێژی به‌كاربهێنێت بۆ ئه‌وه‌ی یارمه‌تی بدات له‌سه‌ر گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره‌و له‌و ده‌ ڕۆژه‌دا به‌رده‌وام بێت له‌سه‌ر په‌رستن؟

و نابینین كه‌ دروست بێت ئه‌و حه‌بانه‌ به‌كاربهێنێت بۆ ئه‌وه‌ی یارمه‌تی بدات له‌سه‌ر گوێڕایه‌ڵی خوای گه‌وره‌، چونكه‌ بێ نوێژی شتێكه‌ خوای گه‌وره‌ له‌سه‌ر كچانی ئاده‌می نوسیوه‌، وه‌ پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)، چوو بۆ لای عائیشه‌ (خوای لێ ڕازی بێت) كه‌ له‌ حه‌جی ماڵئاوایدا له‌گه‌ڵیدا بوو، وه‌ له‌ ئیحرامی عومره‌دا بوو تووشی بێ نوێژی ببوو پێش ئه‌وه‌ی بگاته‌ مه‌ككه‌، بینی ده‌گریا پێی فه‌رموو: چی ده‌تگرێنێت؟ ئه‌ویش پێی ڕاگه‌یاند كه‌ توشی بێ نوێژی بووه‌، پێغه‌مبه‌ریش (صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووی: ﴿إنَّ هذا شَيءٌ كَتَبَهُ اللهُ على بَناتِ آدم﴾[٧٨].

---

٧٦-(اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٧٥).

٧٧- (اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٨٨).

٧٨- (صحيح سنن أبي داود: ١٧٨٢).

واتە: ئەمە شتێكە خوای گەورە لەسەر كچانی ئادەمی نوسیوە.

بۆیە بێ نوێژی لە خۆیەوە نییە ئەگەر لە دە ڕۆژی كۆتایی ڕەمەزاندا هات با ڕازی بێت بەوەی كە خوای گەورە لەسەری نوسیوێتی، و ئەو حەبانەیش بەكارنەهێنێت، وە لە پزیشكی باوەڕ پێكراوەوە پێم ڕاگەیەنراوە كە ئەم حەبانە زیان بە ڕەحمو خوێن دەگەیەنێت، وە لەوانەیە هۆكارێك بێت بۆ تێكچونی شێوەی كۆرپە ئەگەر منداڵی ببێت، بۆیە وا دەبینین خۆی لێ دوور بخاتەوەو سوپاسی خوای گەورە بكات كە توشی بێ نوێژی دەبێت و واز لە نوێژو ڕۆژوو دێنێت، چونكە ئەمە بە قەزاو قەدەری خوای گەورەیە نەك بە دەستی خۆی[٧٩].

**ڕۆژوو شكاندنی ڕێبوار لەسەفەردا:**

پ٣٩ ئایا دروستە ڕێبوار ئەگەر گەیشتەوە شارەكەی خۆی بەردەوام بێت لە بەڕۆژوو نەبوون هەرچەندە ئەم شتە زەحمەتیش بێت لە سەری؟ وە ئایا پاداشتی ڕێبواری ڕۆژووەوان چەند جارێكە لەگەڵ ئەوەی ئێستا هەموو هۆكارێك ئاسانە؟

و ئەگەر مرۆڤـ بگاتە ئەو شارەی كە بۆی چووەو بە ڕۆژوو بێت ئاساییە ئەگەر ڕۆژووەكەی بشكێنێت، چونكە ڕۆژووەوان لەسەفەردا هەڵبژاردن بە ویستی خۆیەتی، ئەگەر وویستی لێ بێت بەردەوام دەبێت لە بەڕۆژوو بوون، وە ئەگەر ویستیشی لێ بێت ڕۆژووەكەی دەشكێنێت، بەڵام ئەگەر بگاتەوە شارەكەی خۆی وبەڕۆژوو بێت ئەوا پێویستە لەسەری بەردەوام بێت لەسەر بەڕۆژوو بوونەكەی، وە حەڵاڵ نییە بۆی ڕۆژووەكەی بشكێنێت، بەڵام ئەگەر بگاتەوە شارەكەی خۆی و لەسەفەردا ڕۆژووەكەی شكاند بێت ئەوا پێویست نییە لەسەری خۆی بگرێتەوە لە خواردن وخواردنەوە، چونكە ئەم خۆگرتنەوەیە هیچ سودێكی پێ ناگەیەنێت كە ئەم سەرەتای ڕۆژ ڕۆژووەكەی شكاندووە، وەئەمە پێی ناوترێت ڕۆژوو وە بۆی هەیە بخوات و بخواتەوە تا خۆر ئاوا

---

٧٩- (اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٩٠-٩١).

بوون، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له‌وه‌ ترسا خه‌ڵكی تۆمه‌ت باری بكه‌ن به‌وه‌ی كه‌ به‌ ڕۆژو نابێت و هاوشێوه‌ی ئه‌مانه‌ ئه‌وا ده‌بێت به‌ نهێنی بخوات و بخواته‌وه‌و كه‌س نه‌یبینێت[٨٠].

## له‌به‌ر كردنی جل وبه‌رگێك كه‌ وێنه‌ی تێدا بێت:

پ٤٠ حوكمی له‌به‌ركردنی ئه‌و جل وبه‌رگانه‌ چی‌یه‌ كه‌ وێنه‌ی تێدایه‌؟

و له‌به‌ر كردنی ئه‌و جل وبه‌رگانه‌ی كه‌ وێنه‌ی تێدایه‌ دروست نی‌یه‌، ئیتر ئایا جل وبه‌رگی منداڵان بێت یان گه‌وره‌، هه‌روه‌ها هێشتنه‌وه‌ی وێنه‌ بۆ یادگاری یاخود جگه‌ له‌ یادگاری دروست نی‌یه‌ ، مه‌گه‌ر وا بخوازێت وه‌كو وێنه‌ی مامه‌ڵه‌، وه‌هه‌ر كه‌سێك وا گومانی بردبێت كه‌ من فه‌توای ئه‌وه‌م داوه‌ كه‌ وێنه‌ی حه‌رام ته‌نها خاوه‌ن لاشه‌یه‌ ئه‌وا درۆی بۆمان هه‌ڵبه‌ستووه‌.......

چونكه‌ پێغه‌مبه‌ر(صلی الله علیه وسلم) فه‌رموویه‌تی: ﴿إِنَّ المَلائِكَةَ لا تَدْخُلُ بَيْتاً فيهِ صُورَةٌ﴾[٨١]. واته‌: فریشته‌ی ره‌حمه‌ت ناچێته‌ هیچماڵێكه‌وه‌ كه‌ وێنه‌ی تێدا بێت.

بۆیه‌ رێگه‌ ناده‌ین به‌كه‌س وێنه‌ بهێڵێته‌وه‌ بۆ یادگاری هه‌روه‌كو ده‌ڵێن، وه‌هه‌ركه‌سێك وێنه‌ی هێشتۆته‌وه‌ وهه‌ڵگرتووه‌ بۆ یادگاری ئه‌وا پێویسته‌ له‌سه‌ری بیدڕێنێت وله‌ناوی به‌رێت، ئیتر جیاوازی نی‌یه‌ ئایا هه‌ڵیواسیوه‌ به‌ دیواره‌وه‌، یاخود خستویه‌تی‌یه‌ ناو ئه‌لبوومه‌وه‌، یاخود جگه‌ له‌مانه‌، چونكه‌ هێشتنه‌وه‌ی وێنه‌ خه‌ڵكی ئه‌و ماڵه‌ بێ به‌ش ده‌كات له‌ چونه‌ ژووره‌وه‌ی فریشته‌ی ره‌حمه‌ت[٨٢].

---

٨٠- (اللقاء الشهري، رقم: ٨، ص٨٥).

٨١- (صحيح الجامع الصغير: ٧٢٦١).

٨٢- (المسائل الميسرة في زينة المرأة المسلمة: ص٤٢).

## فیكه لێدان وچه پڵه لێدان:

پ٤١ حوكمی فیكه لێدان وچه‌پڵه لێدان چی‌یه ؟

و ده‌ركه‌وتووه كه ئه‌مانه له‌جگه له موسڵمانانه‌وه وه‌رگیراوه، بۆیه نابێت موسڵمانان به‌كاری بهێنن، وه ئه‌گه‌ر به شتێكیش سه‌رسام بوون ئه‌وا با الله أكبر یاخود سبحان الله بكه‌ن، هه‌روه‌ها نابێت الله أكبر (ته‌كبیر كردن) به‌كۆمه‌ڵ بێت، هه‌روه‌كو هه‌ندێك له خه‌ڵكی ده‌یكه‌ن، به‌ڵكو مرۆڤـ له نێوان خۆی ونه‌فسیدا سبحان الله ده‌كات، به‌ڵام ته‌كبیر كردن به كۆمه‌ڵ و سبحان الله كردنی به كۆمه‌ڵ كاتێك كه شتێكی سه‌رسوڕهێنه‌ر ده‌بێت ئه‌وا نازانم هیچ بنچینه‌یه‌كی هه‌بێت[٨٣].

## له پێ كردنی پانتۆڵ بۆ ئافره‌تان:

پ٤٢ حوكمی له‌پێ كردنی پانتۆڵ چی‌یه بۆ ئافره‌تان ؟

و پانتۆڵ قه‌باره‌ی قاچ وسك وپه‌راسو ومه‌مكی ئافره‌ت ده‌رده‌خات، بۆیه ئه‌و ئافره‌ته‌ی پانتۆڵ له‌پێ ده‌كات ئه‌م فه‌رمووده صه‌حیحه ده‌یگرێته‌وه كه پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) ده‌فه‌رمێت: ﴿صِنْفانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لم أرَهُما.....ونِساءٌ كاسِياتٌ عارِياتٌ مُمِيلاتٌ مائِلاتٌ رؤوسُهُنَّ كأَسْنِمَةِ البُخْتِ المائِلةِ، لا يَدْخُلْنَ الجنةَ ولا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وإنَّ رِيحَها لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذا وَكَذا﴾[٨٤].

واته: دوو كۆمه‌ڵ هه‌ن ئه‌هلی دۆزه‌خن وهێشتا من نه‌مبینیون......وه ئافره‌تانی پۆشته‌ی رووت سه‌ره‌نجی پیاوان راده‌كێشن به‌لای خۆیاندا وبه‌لاروله‌نجه‌وه ده‌ڕۆن به رێدا، قژه‌كانیان له‌بان سه‌ریان به‌ستووه وه‌كو بان پشتی وشتر به‌رزیان كردۆته‌وه، ئه‌مانه به‌هۆی ئه‌م كرده‌وه‌یانه‌وه ناچنه به‌هه‌شته‌وه، وه بۆنی به‌هه‌شتیش ناكه‌ن، هه‌رچه‌نده بۆنی به‌هه‌شت ده‌كرێت له‌دووری ئه‌وه‌نده‌و ده‌وه‌نده‌وه.

---

٨٣- (المسائل الميسرة في زينة المرأة المسلمة: ص٨١).

٨٤- (صحيح الجامع الصغير: ٣٧٩٩).

بۆیه ئامۆژگاریم بۆ ئافره‌تانی باوه‌ڕدار ئه‌وه‌یه كه له خوای گه‌وره بترسن وسوربن له‌سه‌ر جل وبه‌رگی ئیسلامی داپۆشه‌ر، وه پاره‌ی خۆیان به فیڕۆ نه‌ده‌ن له كڕینی ئه‌م جل وبه‌رگانه‌دا. والله الموفق.

وه پرسیاركرا له‌پایه‌به‌رزیان: به‌ڵگه‌ی ئه‌و ئافره‌تانه‌ی كه پانتۆڵ ده‌كه‌ن ئه‌وه‌یه ده‌ڵێن: پانتۆڵ فراوانه‌و ته‌سك نی‌یه وداپۆشه‌ره؟

فه‌رمووی: ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر پانتۆڵه‌كه فراوانیش بێت، چونكه جیاكردنه‌وه‌ی قاچێكی له قاچه‌كه‌ی تری شتێكه له دانه‌پۆشراوی، پاشان له‌وه ده‌ترسین كه له خۆ چواندنی ئافره‌تان بێت به پیاوان، چونكه پانتۆڵ جل وبه‌رگی پیاوانه، وه‌پێغه‌مبه‌ریش (صلى الله عليه وسلم) نه‌فره‌تی له‌و ئافره‌تانه كردووه كه خۆیان ده‌چوێنن به پیاوان(٨٥).

## بڕینی قژی ئافره‌ت تا ناو شانی بۆجوانی، وبه‌كارهێنانی ئامێره‌كانی جوانكاری بۆ مێرد:

پ٤٣ حوكمی بڕینی قژی ئافره‌ت چی‌یه تا ناو شانی بۆجوانی، ئیتر ئایا شوی كردبێت یان نا؟ وه‌حوكمی به‌كارهێنانی ئامێره‌كانی جوانكاری زانراو چی‌یه بۆ خۆجوان كردن بۆ مێرد؟

و بڕینی قژی ئافره‌ت یاخود به‌شێوه‌یه‌كه كه له قژی پیاوان بچێت، ئه‌مه حه‌رامه‌و له‌تاوانه گه‌وره‌كانه، چونكه پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) نه‌فره‌تی له‌و ئافره‌تانه كردووه كه خۆیان ده‌چوێنن به پیاوان، یاخود به‌شێوه‌یه‌كه ناگاته خۆچواندن به پیاوان، ئه‌مه‌یان زانایان بۆچونیان جیاوازه‌و سێ بۆچونیان هه‌یه:

بۆچونی یه‌كه‌م: ده‌ڵێن: دروسته.

بۆچونی دووه‌م: ده‌ڵێن: حه‌رامه.

بۆچونی سێیه‌م: ده‌ڵێن: مه‌كروهه.

---

٨٥- (المسائل الميسرة في زينة المرأة المسلمة: ص٩٨-٩٩)

ئه‌وه‌ی كه بڵاو بێت له مه‌زهه‌بی ئیمامی ئه‌حمه‌د ئه‌وه‌یه كه مه‌كروهه، له راستیدا نابێت ئێمه هه‌رچی داب ونه‌ریتێك كه له جگه له خۆمانه‌وه بۆمان هات وه‌ری بگرین، ئیمه پێش سه‌رده‌مێكی نزیك ده‌مان بینی ئافره‌تان شانازی‌یان ده‌كرد به قژ درێژی وزۆری قژیان، چی‌یانه ئێستا ئه‌م كاره ده‌كه‌ن كه له وولاَتانی تره‌وه بۆمان هاتووه، وه‌من به‌رهه‌ڵستی هه‌موو شتێكی تازه ناكه‌م، به‌ڵام به‌رهه‌ڵستی هه‌موو شتێك ده‌كه‌م كه كۆمه‌ڵگا بگۆڕێت بۆ داب ونه‌ریتێك كه له جگه له موسڵمانانه‌وه هاتبێت.

وه‌به‌كارهێنانی ئامێره‌كانی خۆجوان كردن وه‌كو سوراو ئاسایی‌یه و هیچی تێدا نی‌یه، هه‌روه‌ها سوركردنی رووم‌ه‌ت به‌تایبه‌تی بۆئافره‌تێك كه شووی كردبێت (به‌ڵام ئه‌گه‌ر زیانی هه‌بێت ئه‌وا قه‌ده‌غه ده‌كرێت له‌به‌ر زیانه‌كه‌ی).

به‌ڵام ئه‌و خۆجوان كردنه‌ی كه هه‌ندێك له ئافره‌تان ده‌یكه‌ن به برۆهه‌ڵگرتن، ئیتر هه‌ڵكێشانی بێت یاخود باریك كردنه‌وه‌ی ئه‌وا حه‌رامه، چونكه پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) نه‌فره‌تی كردووه له‌و ئافره‌تانه‌ی كه برۆ هه‌ڵده‌گرن، وه‌له‌و ئافره‌تانه‌یش كه بۆیان هه‌ڵده‌گرن، هه‌روه‌ها ددان شاش كردنی ئافره‌تان بۆ جوانی حه‌رامه‌و نه‌فره‌تی لیٚ كراوه[٨٦].

## پاك بوونه‌وه‌ی ئافره‌ت له‌بیٚ نوێژی (الحيض) وبه‌رۆژووبوونی:

پ٤٤ ئه‌گه‌ر ئافره‌ت پاك بووه‌وه له بیٚ نوێژی وغوسڵی ده‌ركرد پاش نوێژی به‌یانی ونوێژی كرد وبه‌رۆژوو بوو، ئایا پێویسته له‌سه‌ری ئه‌و رۆژه بگێڕێته‌وه؟

و ئه‌گه‌ر ئافره‌ت له‌بیٚ نوێژی پاك بووه‌وه پێش ده‌ركه‌وتنی فه‌جر ئه‌گه‌ر به‌ته‌نها یه‌ك ده‌قیقه‌یش بێت به‌ڵام دڵنیا بێت كه پاك بۆته‌وه، ئه‌گه‌ر له ره‌مه‌زاندا بێت ئه‌وا پێویسته له‌سه‌ری به‌رۆژوو بێت، وه‌رۆژوو گرتنه‌كه‌ی له‌و رۆژه‌دا ته‌واوه وپێویست ناكات قه‌زای بكاته‌وه، چونكه به پاكی به‌رۆژوو

٨٦-(المسائل الميسرة في زينة المرأة المسلمة: ص٩٩).

بووە هەرچەندە ئەگەر غوسڵ دەرنەكات تا پاش دەركەوتنی فەجر ئەوا ئاساییەو هیچ شتێكی تێدا نییە، هەروەكو چۆن ئەگەر پیاو لەشی گران بێت بەهۆی كۆبوونەوەی لەگەڵ خێزانی، یاخود خەوبینینی ( إحتلام) بوونی، ئەوا ئەگەر پاششێو بكات وغوسڵ دەرنەكات ئیللا پاش دەركەوتنی فەجر نەبێت ئەوا ڕۆژووەكەی تەواوە.

وە بەم بۆنەیەوە دەمەوێت شتێكی تر روون بكەمەوە لەلای ئافرەتان ئەویش ئەوەیە ئەگەر توشی بێ نوێژی بوون لەپاش ڕۆژوو شكاندنیان پێش ئەوەی نوێژی شێوان (عیشاء) بكەن وا دەزانن ڕۆژووی ئەو ڕۆژەیان بەتاڵ بۆتەوە، كە ئەمەیش هیچ بنچینەیەكی نییە ئەگەر لەپاش خۆرئاوا بوون توشی بێ نوێژی بوون ئەگەر بەیەك دەقیقەیش بێت ئەوا ڕۆژوو گرتنەكەیان تەواوە[٨٧].

## پاك بونەوەی ئافرەتی زەیستان (النفساء) پێش چلەی:

پ٤٥ ئایا نوێژو ڕۆژوو پێویستە لەسەر ئافرەتی زەیستان ئەگەر پاك بووەوە پێش چلەی؟

و بەڵێ.. هەركاتێك ئافرەتی زەیستان پێش چلەی پاك بوەوە ئەوا پێویستە لەسەری نوێژ بكات، وەبەڕۆژوو بێت ئەگەر لە رەمەزاندا بێت، وە دروستە كۆ ببێتەوە لەگەڵ مێردەكەی، چونكە پاكەو هیچ شتێك نییە قەدەغەی نوێژ وڕۆژوو كۆبوونەوەی لێ بكات[٨٨].

## بینینی خوێنی بێنوێژی ڕۆژێك ونەمانی بۆ ڕۆژی داهاتوو:

پ٤٦ ئەگەر ئافرەت لەكاتی بێ نوێژی ڕۆژێك خوێنی بینی وڕۆژی پاش تر نەیبینی...پێویستە لەسەری چی بكات؟

و ئەوەی ئاشكرا بێت ئەوەیە كە ئەم پاكێتیيە یاخود وشكیيە كە ڕوویداوە لە ڕۆژانی بێ نوێژیدا بەبێ نوێژی دەژمێردرێت وحسابی پاكێتی بۆ ناكرێت، بۆیە دەبێت خۆی بگرێتەوە لەو شتانەی كە

---

٨٧- (رسالة في الدماء الطبيعية للنساء: ص٦٥-٦٦).

٨٨- (رسالة في الدماء الطبيعية للنساء: ص٦٦).

ئافره‌تان له‌بێ نوێژیدا خۆیانی لێ ده‌گرنه‌وه‌، وه‌هه‌ندێك له‌ زانایان ده‌فه‌رموون: هه‌ركاتێك رۆژێك خوێنی بینی ورۆژێك پاك بووه‌وه‌، ئه‌وا خوێنه‌كه‌ خوێنی بێ نوێژی‌یه‌ وپاكێتی‌یه‌كه‌یش پاك بوونه‌وه‌یه‌ هه‌تا ده‌گاته‌ پانزه‌ رۆژ، له‌پاش پانزه‌ رۆژه‌كه‌ ئه‌و كاته‌ خوێنه‌كه‌ حسابی نه‌زیفی (إستحاضة)ی بۆ ده‌كرێت، وه‌ئه‌مه‌ به‌ناوبانگه‌ له‌ مه‌زهه‌بی ئیمامی ئه‌حمه‌دی كوڕی حه‌نبه‌ل ( ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت)[٨٩].

## حوكمی فرۆشتنی ئه‌ڵقه‌ی ئاڵتون بۆ پیاوان:

پ٤٧ حوكمی فرۆشتنی ئه‌ڵقه‌ی ئاڵتون بۆ پیاوان چی‌یه‌ ئه‌گه‌ر زه‌ره‌نگه‌ره‌كه‌ دڵنیا بێت له‌وه‌ی كه‌ كڕیاره‌ پیاوه‌كه‌ له‌ده‌ستی ده‌كات؟

و فرۆشتنی ئاڵتون بۆ پیاوان حه‌رامه‌ ئه‌گه‌ر فرۆشیاره‌كه‌ بزانێت كه‌ كڕیاره‌ پیاوه‌كه‌ له‌ ده‌ستی ده‌كات، یاخود گومانی زاڵ بوو به‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ ده‌ستی ده‌كات، چونكه‌ ئاڵتون حه‌رامه‌ بۆ پیاوانی ئه‌م ئوممه‌ته‌، ئه‌گه‌ر بیفرۆشێت به‌ پیاوێك كه‌ بزانێت له‌ده‌ستی ده‌كات، یاخود گومانی زاڵ بوو به‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ خۆی له‌ ده‌ستی ده‌كات ئه‌وا یارمه‌تی داوه‌ له‌سه‌ر تاوان كردن كه‌ خوای گه‌وره‌ قه‌ده‌غه‌ی كردووه‌ كه‌ ده‌فه‌رمێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ [المائدة: ٢].

واته‌: ئێوه‌ هاوكاری یه‌كتری بكه‌ن له‌سه‌ر چاكه‌و له‌ خواترسان وخۆپارێزی له‌تاوان، وه‌ هاوكاری یه‌كتری مه‌كه‌ن له‌سه‌ر تاوان و دوژمنكاری یه‌كتری.

وه‌ زه‌ره‌نگه‌ریش حه‌ڵاڵ نی‌یه‌ بۆی ئه‌ڵقه‌ی ئاڵتون دروست بكات بۆ ئه‌وه‌ی پیاوان له‌ ده‌ستی بكه‌ن[٩٠].

---

٨٩- (رسالة في الدماء الطبيعية للنساء: ص٦٨-٦٩).

٩٠- (فقه وفتاوى البيوع: ص١٤٢).

**فرۆشتنی ئاڵتون به پاره نابێت تا هەموو پارەكه وەرنەگرێت:**

پ٤٨ حوكمی فرۆشتنی ئاڵتون چییه بەقەرز؟ وه ئەگەر بۆ خزم بێت لەوه دەترسم كه پەیوەندی خزمایەتیم لەگەڵ ببچڕێنێت ئەگەر به قەرز نەیدەمێ، لەگەڵ ئەوەی كه دڵنیام لەوەی كه له داهاتودا پارەكەم دەداتێ؟

و پێویسته یاسای گشتی بزانیت كه فرۆشتنی ئاڵتون به پاره دروست نییه ئیللا دەبێت پارەكه تەواو وەربگریت، وه جیاوازی نییه له نێوان نزیك ودوور ( خزم و بێگانه) چونكه نابێت خۆشەویستی بكرێت لەسەر حسابی دینی خوای گەوره بۆ هیچ كەسێك، وەئەگەر خزمەكەت لێت تووڕه بوو بەهۆی گوێڕایەڵی كردنت بۆ خوای گەوره با تووڕه بێت ئەوا ئەو ستەمكاری تاوانباره كه دەیەوێت تۆ توشی تاوان و سەرپێچی كردنی فەرمانی خوای گەوره بكات، وه تۆ له ڕاستیدا چاكەت لەگەڵیدا كردووه كاتێك كه قەدەغەت كردووه لەوەی كه مامەڵەیەكی حەرامت لەگەڵدا بكات، وه ئەگەر لێت تووڕه بوو یاخود پەیوەندی لەگەڵتدا بڕی ئەوا ئەو تاوانباره و تۆ هیچ تاوانێكت لەسەر نییه[٩١].

**حوكمی فرۆشتنی ئەو ئاڵتونەی كه ڕەسم و وێنەی تێدایه :**

پ٤٩ حوكمی فرۆشتنی ئەو ئاڵتونه چییه كه ڕەسم و وێنەی تێدایه وەكو پەپولەو سەری مار وهاوشێوەی ئەمانه؟

و خشڵی زێڕو زیو كەلەسەر شێوەو وێنەی ئاژەڵ دروست كرابێت ئەوا كڕین وفرۆشتنی حەرامه، وەخۆڕازاندنەوەو لەدەست كردن وهەڵگرتنی حەرامه، چونكه پێویسته لەسەر موسڵمان وێنه بشكێنێت ولەناوی بەرێت ونەیهێڵێت، هەروەكو چۆن له صەحیحی موسلیمدا هاتووه كه ئیمامی

٩١- (فقه وفتاوى البيوع: ص١٤٦).

عەلی(خوای لێ ڕازی بێت) بە أبو هياج الأسدي دەفەرمێت: ( ألا أبْعَثُكَ على ما بَعَثَنِي عليه رسولُ اللهِ: ألا تَدَعَ صُورَةً إلا طَمَسْتَهَا، ولا قَبْراً مُشْرِفاً إلا سَوَّيْتَهُ )[92].

واتە: ئایا نەتنێرم بۆ شتێك كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) منی بۆ ناردووە: ئەویش ئەوەیە هیچ وێنەیەك نەهێلیت ئیللا لەناوی بەریت، وە هیچ گۆڕێكی بەرز نەهێلیت ئیللا تەختی بكەیت. وە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ( إنَّ الملائِكَةَ لا تَدْخُلُ بَيْتاً فِيه صُورَة )[93].

واتە: فریشتەی ڕەحمەت ناچنە هیچماڵێكەوە كە وێنەی تێدا بێت. بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان خۆیان دور بگرن لەبەكارهێنانی ئەم جۆرە خشڵەو كڕین وفرۆشتنی[94].

**دەرچونی ئافرەت بۆ بازاڕ بەبێ مەحرەم:**

پ٥٠ ئایا دەرچونی ئافرەت بۆ بازاڕ بەبێ مەحرەم دروستە یان نا؟ وەچ كاتێك دروستەو چ كاتێك حەرامە؟

و دەرچونی ئافرەت بۆ بازاڕ لە بنچینەدا دروستە، وەبە مەرج نەگیراوە كە مەحرەمی لەگەڵدا بێت، مەگەر لە فیتنە بترسێت، ئەگەر وابوو ئەوا پێویستە لەسەری بەبێ مەحرەمێك دەرنەچێت كە بیپارێزێت، وە بۆ دەرچونی بۆ بازاڕ مەرجە كە بە داپۆشراوی دەرچێت و جوانی خۆی دەرنەخات، وە بۆن لە خۆی نەدات، ئەگەر لەكاتی دەرچونیدا جوانی خۆی دەرخست، یاخود بۆنی لە خۆی دا ئەوا حەڵاڵ نی یە بۆی دەرچێت لەماڵ، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت:

﴿ لا تَمْنَعُوا إماءَ اللهِ مَساجِدَ اللهِ، وَلْيَخْرُجْنَ تَفِلات﴾[95].

---

٩٢- (مسلم، كتاب الجنائز، باب الأمر بتسوية القبر: ٩٦٩).

٩٣- (صحيح الجامع الصغير: ٧٢٦١).

٩٤- (فقه وفتاوى البيوع، ص:١٤٧).

٩٥- (رواه أحمد وأبوداود) ،وصححه الشيخ الألباني في (الإرواء ) (٥١٥) و(صحيح أبي داود) (٥٢٩).

واتە: قەدەغەی ئافرەتانی بەندەی خوا مەكەن لە چونیان بۆ مزگەوت، بەڵام كە دەرچون با بەبێ بۆن دان لە خۆیان دەرچن، وە جوانی خۆیان دەرنەخەن.

چونكە بە دەرچونیان بە بۆن لە خۆدان ودەرخستنی جوانی فیتنەی تێدایە بۆخۆیان وجگە لە خۆیان، وە ئەگەر ئەمین بوون لە فیتنە ولەسەر شێوازی داواكراو لێیان دەرچون بەبێ بۆن لە خۆدان ودەرخستنی جوانی ورووتی ئەوا لەدەرچونەكەیاندا هیچ شتێكی تێدا نییە، وە ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، دەردەچون بۆ بازاڕ بەبێ مەحرەم[٩٦].

تەواو بوم لە وەرگێڕانی ئەم پەرتوكە بەسودە

لە رۆژی شەممە

بەرواری ٢٥ی رجب ١٤٢٧ك

بەرامبەر١٩/٨/٢٠٠٦ز

**والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات**

---

٩٦- (أسئلة مهمة أجاب عليها فضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين: ص١٥-١٦).

**سەرچاوەکان**

١- إجابات مفيدة وتوجيهات سديدة من كلام فضيلة الشيخ:محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)تأليف:محمد الناصر العريني.

٢- أسئلة مهمة أجاب عنها فضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)، دار الوطن للنشر.

٣- رسالة في الدماء الطبيعية للنساء، تأليف فضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)،

٤- فتاوى مهمة لعموم الأمة، سماحة الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله ابن باز(رحمه الله)، وفضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)، جمع وأعداد: إبراهيم بن عثمان الفارسي.

٥- فتاوى وأذكار لإتحاف الأخيار، سماحة الشيخ عبدالعزيز بن عبدالله ابن باز (رحمه الله)، وفضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله) جمع وترتيب محمد الناصر العريني.

٦- فتاوى الأئمة في النوازل المدلهمة، جمع وترتيب: محمد بن حسين بن سعيد آل سفران القحطاني، راجعه وصححه: فضيلة الشيخ العلامة: د. صالح بن فوزان الفوزان.

٧- فقه وفتاوى البيوع: الشيخ عبدالرحمن السعدي(رحمه الله)، الشيخ محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)، الشيخ صالح بن عبدالله الفوزان، اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء. راجعه وخرج أحاديثه: د.عماد علي عبدالسميع.

٨- لقاء الباب المفتوح رقم(٣) مع فضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)، إعداد الدكتور عبدالله بن محمد بن أحمد الطيار.

٩- لقاء الباب المفتوح رقم (٢٥) مع فضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين

(رحمه الله)، إعداد الدكتور عبدالله بن محمد بن أحمد الطيار.

١٠- اللقاء الشهري رقم (٨)مع فضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)، إعداد الدكتور عبدالله بن محمد بن أحمد الطيار.

١١- اللقاء الشهري رقم (١٣)مع فضيلة الشيخ: محمد بن صالح العثيمين(رحمه الله)، إعداد الدكتور عبدالله بن محمد بن أحمد الطيار.

١٢- المسائل الميسرة في زينة المرأة المسلمة، إعداد: محمد بن عبدالله بن إبراهيم الشائع.